# نوستووی بەر باران

کۆمەڵە شیعرێکی هەڵبژاردەی ئەدەبی بێگانەیە

نەژاد عزیز سورمێ

**کردوویە بە کوردی**

**چاپی دووەم – زیادو بژارکراو**

**2005**



* نوستووی بەر باران.
کۆمەڵە شیعرێکی هەڵبژاردەی ئەدەبی بێگانەیە.
* نەژاد عزیز سورمێ کردوویە بە کوردی.
* هەندێ لە تایتلەکان: هونەرمەند محەمەد زادە.
* مۆنتیفەکان: هونەرمەند عەبدوللا رەسووڵ.
* نەخشەسازی: شکار نەقشبەندی.
* بەرگ و دەرهێنانی هونەری: وەرگێڕ.
* چاپی یەکەم - 1980- چاپخانەی (علاء) بەغدا.
* چاپی دووەم- زیادو بژارکراو 2005- هەولێر- کوردستان.
* ژمارەی سپاردن: 484.
* چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی کوردستان.

*«شیعر هەمیشە خوێی ژیانم بووە..
ئەگەر شیعر نەبووایە، ژیانیشم هیچ
مانایەکی نەدەبوو..*

*لای ئێمە، لە شاخەکان، خانە خوێ
هەرگیز لەبیری ناچێ، خوێدانێ لەسەر
سفرەی میوانان دابنێ..»*

**ڕەسوڵ هەمزاتۆف**



# 4

## گۆرانیی داریوش

### گۆرانیی یەکەم

دەربەدەری هەمیشەیی،
قەرەجی سەد ساڵە منم
خاکی تەواوی جادەکان،
کفنی کۆنینەی تەنم
بەهەزار ڕێدا ڕۆیشتووم
هەزار برینم کەوتوونێ
تاکو زیندووم بکەیتەوە
هەزارەها جار مردووم!
شەوێ سەرم دانابوو..

مەشخەڵێکت لەشەوی مەرگ داگیرسان
بۆ هەڵدڕینی لەشی من..
چڕنووکی(هەڵۆ)ت هێنا ،
بێ ماڵ و حاڵ، قەلەندەرم
ونبوویەکی دەربەدەرم
نزمتر لە خاکی زەمین
لە ئاسمان بڵندترم

بێ ماڵ و حاڵەکان سووتان
دەستیان بەستران..
(بێ ڕەحمی)م کرێ
کلۆی قەندم فرۆشت..
کە بووی بە با
بووم بە هەناسە
چەکوشت وەشاند
پارچە پارچە بووم، توامەوە
کە بووی بە ئاو
بووم بە مەترسیی



بەردت وەشاند
بووم بە مینا
بێ ماڵ و حاڵ، قەلەندەرم
ونبوویەکی دەربەدەرم
نزمتر لە خاکی زەمین
لە ئاسمان باڵاترم

بووم بە مەلی کۆڵانە ڕەنگینەکان
بە سۆزی تۆوە بووم بە خاک
بۆ تۆ
ئەوەی کە تۆ ویستت ببم
تەماشا چۆن چۆنی بووم..
کە بە خاکیشت سپاردم
بووم بە خوێن بەڕەگ و ڕیشەی زەمانەدا
لەبەر پێی تۆ، لە سێبەر زیاتر نەبووم
بووم بە ڕێبوارێکی بێ شوێن..
بووم بە ژیان..

سێبەری تۆ وەختی سەفەر..
بێ ماڵ وحاڵ، قەلەندەرم
ونبوویەکی دەربەدەرم
نزمتر لە خاکی زەمین
لە ئاسمان باڵاترم..



## گۆرانیی دووەم

تەنیا شیعرم بۆ ئاخافتن بەدەست ماوە.
تەمەن ڕۆیی، تەنیا سێ قسەم لە دڵ ماوە
دەنگ، کە هەتوانی هاوار بوو،
برینەکانم، لە پێش دەردی گەورەی دڵم شەرمەزارن..

لەدەست خۆشەویستەکەم، چ بڵێم
گلەیی نییە..
گلەییش هەبێت، ئیتر حەوسەڵە نەماوە!
هەموو تەمەنم،
سەرگەرمێ بووم بۆ خۆپێکان..
هەموو ساتێکیش وەک ئێستا
دەستەکانم مەشخەڵێ نین..

لە داخی دیداری تۆدا،
ئاوارەتر بووم
هەرچەندە تا ماڵێشتان حەوسەڵە نییە
ڕووبەڕووی تۆ چیم ئەمن؟
دیلێکی دەست لەسەر سنگ..
سیمایەکی پاڵپشتی تۆ
کاتێ گەردی ئاوێنەبووی..
من بۆ تۆ کێم؟
تەنیایەکم
کە جیهانێک ئازارمان لە نێوان دایە..



ئەی وەک من نزیک!
کاشکی دەتزانی من بۆ تۆ کێم؟
لەتۆ زیاتر، لە هەموو دنیا زیاتر
لەخۆم ماندووم..
سەختی بەردم، بەڵام شکاوم
خۆزگە لە گۆچانی دەستما
یا لە پشتی شکاوما، دەتخوێندەوە
تا بزانی زیاتر لەتۆ، لەخۆم ماندووم..



لەدەردی(لەگەڵ تۆ بوون) دام
لە بێ دەنگیی خۆما
عاشق نیم.. ئۆقرەم
ئەمن هەیکەلی ئەشکەنجەم..
تۆ سەراپا بێ خەیاڵی، بێ خەمی..
من بەو هەموو خۆڕاگرتن و چاوقایمییەوە
تۆ تێنەگەیی، چ دەردێ
لە چۆکی ماندوو و تاکمایە..

لەژێر(باران)، پێکەوە بووین
من هێمنیم دەخواردەوە
ئەمە بەشی ژیان نییە
گیان دەگەیێننە سەری لێوان
هیچ شیعرێ شکاوو نابووت
سەرگوزشتەی هاوارەکانی من نییە
ئەمە توانای زمانە..
سەیرکە چ ماندوو چ تەنیا...

خۆزگە وا دەبوو بزانی
من بۆ تۆ کێم؟
لەتۆ زیاتر، لەهەموو دنیا
لە تۆ زیاتر، لەخۆم ماندووم..



## گۆرانیی سێیەم

ئەی دە هاواری من هاتوو
لەم ڕۆژگارەی خۆشکاندن
ئەی چرای میهرەبانی
شەوی تەنیاو دەیجووری من..
ئەی کاکڵی حەقیقەت
لەناو ساتی پیرۆزدا
تۆ بەری شەوت لێ گرتووم
تۆ منت داوەتە تیشکی خۆر

ئەگەر ببی، یا نەبی
تۆ بۆ من پاڵپشتی
بۆ منی غەریب
تۆ هاوڕێیەکی گیانیی
ئەتۆ پەنای
ئەی هاوڕێی هەمیشەو دێرینم!
تۆ بڕۆ سەفەرت خێر..
غەمی منت نەبێ
دووری بۆ من بووەتە عادەت..



پاکیی سۆزی من
شیعری مەستیی گیانی گرتووم..
ڕەگی وشکی بوونی من
خوێنی لە لەشی تۆ وەرگرتووە..
ئەگەر قەرزاری تۆ بم
ئەگەر گیانی من، لەتۆ بێ..
هەمووی ئا بەو ساتە نایێ
کەوا تۆ نیشانت داوم

کاتێ شەو، شەوی سەفەر بوو
کە هەر چرکەیەکی
خەفەبوونی ترسی من بوو
کە برینی خەنجەری خۆشەویستەکەم
چاکترین پۆشاکی من بوو
ئەتۆ بەرگی میهرەبانیی
هەتوانت لەبەرکردم
ئەتۆ ڕاستت دەگەڵ گوتم
زەردەخەنەی شەوانت برد..

ئەی هاوڕێی هەمیشەییمان
تۆ بڕۆ، ئۆغرت خێر..
غەمی منت نەبێ
دووریی بۆ من، بووەتە عادەت..

ئەی زەردەی خۆرهەڵات!
ئەی هاوڕێکەم!
خوداحافیز، سەفەرت خێر..
ئەی تاکە هاوڕێم!
بۆ هەر کوێ بڕۆی..
لەهەر جێیەکی دنیابی
لەو دیو سنوور
لە ئەو دیوی ساتەکان..



وەبیرت بێ، کە دڵت
قەڵغانی بەڵای من بوو
تەنها دەستی تۆ هاوڕێی
دەستی پاکی من بوو..
ئەی هاوڕێی هەمیشەییمان..
ئەتۆ بڕۆ، سەفەرت خێر..
غەمی من مەخۆ،
کە دووریی بۆ من بووەتە عادەت..

## گۆرانیی چوارەم

براگیان، نازانی چ دڵتەنگم
نازانی چ غەمگینم..
نازانی، براگیان، نازانی
گرفتاری کام لەعنەت و تەلیسماتم!
نازانی دەربەدەربوون،
لافاو ئاسا ، هەمیشە لەسەر سەفەربوون
چەندە سەختە!؟



تۆ نازانی براله
میراتگریی دەردو ئازاری باوک
چەندە تاڵە!
دڵم تەنگە براگیان، دڵم تەنگە..

دڵم لەم ڕۆژگارە بێ ئومێدەدا تەنگە، براگیان
لەم ماندوویەتی و شەونخونی و مۆتەکەیە، دڵم تەنگە
لەم دووبارەبوونەوە و ڕۆتینە بێ هودەیە،
دڵتەنگم..
هەمیشە هەر غەم و دەردو کابوسێکە..
دڵم تەنگە.
دڵخۆش نیم براله!
لەم ڕۆتینە بێ خەون و زەردەخەنەیە.. غەمگینم..
ئای چەندە تەنیام
لەمن بەدەر، هەموو خۆشبەخت و عاشقن،
عاشق و دڵشاد..

کەیفم بە سبەینێیە
شایەد خۆری پرشنگداری
خۆشبەختی منی تیا هەڵبێ..
شەوانە بە ڕەنجی تەنیای من سەربنێیوە!
شایەد سبەی ڕۆژی عاشق بوون بێ

## عیشق

**ئیسماعیل شاهروەردی**
**«ئاینده»**

ئەگەر دەنگێ،
گەر سروودێ، وشەیێ
لەدنیادا بمێنێ
دەنگی مرۆڤ..
سروودی مرۆڤ
لەم قسەیەدایە:
عیشقی من





***فرووغی فەڕوخزاد***

- ئەی ئەستێرەکان
- دەردو ماڵئاوایی



## ئەی ئەستێرەکان

ئەی ئەستێرەکان،
کە لە بەرزیی ئاسماندا
بە نیگای خۆتانەوە چاوبز دانیشتوون
ئەی ئەستێرەکانی پشت هەور،
کە بە دیار دنیای ئێمەوە دانیشتوون..
ئا، ئەوە منم کە لە دڵی بێ دەنگی شەوا
نامەی دڵداریی ئەدڕێنم
ئەستێرەکان گەر دەهانام بێن
لەخەمی ئەو، کۆشم پڕ ئەستێرە دەکەم

بۆ دڵێ کە بۆنی وەفای نەکردووە
جەورو ستەمی بێ کۆتایی و بەهانە خۆشترە!
عیشوەو نازی زیرەکانە
لەتەک ئەو هاوڕێ خۆپەسندانە خۆشترە!

ئەی ئەستێرەکان چی بوو لە نیگای مندا
ئەو خوێن گەرمیی و گۆرانی و ئاوازە مرد؟
ئاخر چی بوو ئەستێرەکان لە لێوەکانی ئەودا
ئەو ئاخە گەرمانەی دڵداری مرد؟

جامی بادەم سەرنگون و پێخەفم بەتاڵ
سەرم بەڕووی نامەکانی ئەو کردووە
سەرم پێ کردووە، لەناو دێڕەکاندا
بۆ شوێنەواری وەفای ئەو بگەڕێم..



ئەی ئەستێرەکان مەگەر ئێوەش
لە دووڕوویی و جەفای دانیشتوانی خاک ئاگادارن؟
کە بەم چەشنەن لە دڵی ئاسمانیاندا
ئەستێرەکان، ئەستێرەکانی گەش و پاک؟

من کە ئەوەی هەیەو نییەم دایە بەر شەق
تا کامی ئەو لە عیشقی خۆمدا حەڵاڵ کەم..
لەعنەتی خودا لە من بێت، ئەگەر بێجگە لە جەفا
لەوە زیاتر وەفام بۆ عاشقان هەبێت!!





ئەستێرەکان! ئێوە دڵۆپی فرمێسک ئاسا
سەرتان ناوەتە دامێنی ڕەشی شەوەوە
ئەی ئەو ئەستێرانەی لە جیهانی نەمریدا

کلاورۆژنەیەکتان کردۆتە ئەم جیهانەوە
ڕۆیشت وخۆشەویستیشی لە دڵما هەر ناڕوا،
ئەستێرەکان، ئاخۆ چی بوو منی نەویست؟
ئەی ئەستێران، ئەستێرەکان، ئەستێرەکان
ماڵی ئاوای وێران نەبووی دڵدارە نەمرەکان لە کوێوەیە؟

## دەرد و ماڵئاوایی

ڕۆیشتم، ببەخشە، مەڵێ ئەو بێ وەفابوو
بێجگە لە ماڵئاوایی، ڕێگای ترم بۆ نەمابوو
ئەو عیشقە ئاگرینەی پڕ دەردی بێ ئومێدیی
لەکەندەڵانی گوناه و شێتیەتیمدا کشابوو

ڕۆیشتم کە داغی ماچی پڕ حەسرەتی تۆ
بە فرمێسکی دیدە لە لێوەکانم بشۆرم
ڕۆیشتم لەو سروودەدا، بە ناتەواوی بمێنمەوە
ڕۆیشتم لە خۆڕا ئابڕو بەخۆم بدەم
ڕۆیشتم، مەڵێ مەڵێ بۆ ڕۆیی، نەنگی بوو
عیشقی من و نیازی تۆ و سازو سۆزی هەردووکمان
رازەکانمان..



لە پەردەی تارو خامۆشا
وەکو گەردی بەیانیان وەدەرکەوتن

ڕۆیشتم وەک دڵۆپە فرمێسکێکی گەرم
لە دامێنی گۆشەیەکی شەوەزەنگی ژیان ون بم
ڕۆیشتم، لە ڕەشایی گۆڕێکی بێ ناونیشاندا
لە کۆڵ شەڕو ترسی ژیان ببمەوە..

من لە بەر گریان و دوو چاوی گەش هەڵاتم
لەبەر لافاوی بەتینی پێکەنین، هەڵاتم
لەسەر پێخەفی ژوان،
بە ئامێزی ساردی جودایی
بریندار بە لۆمەی ویژدان، هەڵاتم!

ئەی سینە ، لە گەرمایی کلّپەی خۆتدا بسووتێ و
چیتر سۆراخی گڕی ئاگر لە من مەکە..
دەمویست ببم بە مەشخەڵ و یاخی ببم
بووم بە مەلی گۆشەی قەفەس
باڵ بەستەو دیل!

گیانی هەشتاویم لەشەوی خۆیدا، بێ ئاگایە
بەتاڵییەوە لە دامێنی بێ دەنگیدا گریام..
لەدەست کردەوەکانم دەناڵم و
پەشیمانم لە قسەکانم..
بینیم کەلایەقی تۆ و عیشقی تۆ نیم..





**_دەستەچیلەیێک شیعری ئەرمەنی_**



# کەوانەی مانگ

**ئا: ئاسلان**

بێ هەست و خوست پێک گەیشتین..
دەرگای سێبووریمان لێ بەسترا
کزە ڕۆشنایی سەفەر
کەوانەی مانگی گۆشەی خەڵوەت،
لە ئاسمانا..
تینوو بوو، یادگارەکانی دەنووسی..

دووچاوی گەورە
ڕووبەڕووی چاوەکانم،
بۆچی کزبوون و لەناکاو!
پێکەنین و گرژینەوە؟
دوو پیاڵەی سپیی لە سەرخۆ شکان!
ئەستێرەی سەحەر
جوانە ئەسپی، سپی خۆی تاودا..
کە گوڵی لێوەکانی پشکووت
ئەستێرەیێ لە ئاسمان
بە سەرسامییەوە دارژا..



## دەنگی خوێن

ئا: ئاسلان

نە ئەستێرەی بەرەبەیان بوو
نەمانگ
چاوی تۆ بوو
بە چاوەکانم پێکەنین..

نەشایی بوو، نە ئاهەنگ
دەنگ و ئاوازی خوێنی من بوو
لەژێر پێی تۆدا
ئاوزنگی دەدا..

نە باڵدارێ بوو
نەخەون
سێبەری تۆ بوو ڕۆیی
تا جارێکی تر دڵەکەم،
هەلا هەلا کات!

## مۆتەکە

**زۆرایر میرزایان**

ئاسمان مووەکانم رادەکێشێ
زەمینیش خۆی بە لەشم هەڵواسیوە
منیش پەنا دەبەمە بەر دڵی شەو، لەهانام بێ..
هاواری من،
کە وەک گڕی  ئاگر کڵپە دەکا
یەکەم قرچەی سووتان
لەهەنیەی سڕم دەچەقێ و
زمانی مەشخەڵداری شەو،
ڕێڕەوە ڕۆشنەکان دەلێسێتەوە..
بەڵام من خلۆر دەبمەوە..
لەناو پێچی گەردەلولدا خلۆر دەبمەوە..
دەستە قوڕاوییەکانیشم، بەدەم وچاومەوە گرتووە..



## پاسەوان

**ئارشاویر مەگردیچ**

دێر زەمانێکە هەتاو
بە چەکوشی پەلکەزێڕینەی ڕەنگینی
ئەشکەوتێکی بۆ دروست کردووم..

هەموو ماڵ و دەوڵەتی من، بە دیواری ئەشکەوتەوە
چوار وێنەیە..
چوار وێنەی پارچە پارچە..
خاک: برسی و گۆشەگیرە
ئاو: بەلێوی وشکهەڵاتوو
ئاگر: بە چاوی بێ روناهی
(با)ی بریندار،
لەسەر پێخەفدا کەوتووە..
لە دەروازەی ئەشکەوتەکەم
گوڵبەڕۆژێ پاسەوانەو
بەرابەر هێرشی خۆر وەستاوە.

# سەد ساڵی تر

گالۆست خانس

سەد ساڵی تر
یەکێ دێت و دەڵێت:
-: لێرە،
لەسەر ڕووی ئەم کاغەزە
لە هەناسەی ئەم خاکەدا
لە خانوویەکی ئەم کۆڵانە خوارەدا
مرۆڤێ دەژیا
بە دڵێکی گەورە
بەهەستی پاک و پیس!



بە عیشقی یەکڕەنگیی و بێ وەفایی..
بە پێی ماندوو نەسایەوە..
بەدەستی بۆ ئاسمان بڵندبوو..
بە چاوی بۆ تیشک شێت بوو
بە گفتوگۆ و قسەی ناخۆش
مرۆڤێ دەژیا
مرۆڤێ کە هەموو شتێ
بەکەچ تێدەگەیشت!!
لە باتی نان
تریفەی ئەستێرەی دەجوی
گەردی بە پێیان وەنەبوو
لەجیاتی لەش،
گیانیی ئافرەتی دەویست..

ئەوەی خۆش دەویست، لێی بێزار بوو
وەک ئادەمیزادێ سەر ڕاست،
ڕێی گرتبوو..
هیچ کاتێ کڕنووش بردنی نەدەویست.
ئا ئەو مرۆڤەی،
کە سەد ساڵ لەمەوبەر ژیاوە
ئەو مرۆڤەی دلێرانە
ئاوازی زوڵمی بیستووەو



وتویەتی:
سەد ساڵی تر
یەکێ دێت و دەڵێت:
لێرە:
لەسەر ڕووی ئەم کاغەزە
مرۆڤێک دەژیا
ئینسانی خۆش دەویست..
کەهەموو شوێنێکی پشکنیوەو
تاڵیی چەشتووە..
لەتەواوی ڕێبوارەکانی پرسیوە
بەڵام لای هیچ کەس..
لە هیچ کوچەیێ..
ناونیشانی (عەدالەت)ی نەدۆزیوەتەوە.





# بە گۆچانی دەستم

**ئافیتیک ئاساکیان**

بە گۆچانی دەستی لەرزۆکم
خەمبار، پشت کۆم، داماو
دوای، سالآنێکی دوورو درێژ،
وەلآمێکی نیوەچڵ..دەگەڕێمەوە
نهالی ئازیزمان دەبینم..
حەفت چیای سەرکەشم بڕین و
لە حەفت دەریای قووڵدا پەڕیمەوە..

هەموو شتێکم لەدەست دا،
سواڵکەرێکی غەریب، لەم وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات..
بەڵام ئەوەتا ئاکام
بە پێیان دەگەمەوە وڵاتەکەم
بە دڵێکی تژی خەم، لە گوندی نزیک دەبمەوە:
گەیشتمە برادەرێک لەبرادەرانی منداڵیم،
لەکێڵگەڕا، لەودیو پەرژینی گوندی بانگم کرد:
– (هۆبرادەری دێرین، خوا قەوەتت بدا..
نامناسییەوە؟ زۆر گۆڕاوم ها؟)
برادەرەکەم تێمەوە ڕاماو هیچی نەگوت..
ئەوسا چووم بە گۆچانەکەم شەقام بپێوم،
ئا ئەوەتا کۆنە پەرژینی دارینەی خۆشەویستەکەم
ئەوەتا ئەویش لەبەر دەروازەکەیدا
بە گوڵی بۆنداری دەستی..
– (سڵاو خوشکۆڵە!
خوا حەزی کرد جارێکی تر پێک بگەین..)
سەری دانەواند و
دەربەدەر و غەریبی بەجێ هێشت..



بەپشتی کۆماوەوە ژێرداگەڕام،
کوخەکەمانم بە کۆنە پەرژینی کۆنی دارینەوە لێ دەرکەوت..
پیرە دایکم لەوێ وەستاوە..
(ئەی خانەخوێ، ئەمشەو میوانێکتان هەیە!)
دایکم هەڵدەلەرزی، بەدەستیش پەکوپەکوی بوو:
(ئەوە تۆی لێرە؟!)
بە ماچ و فرمێسک لە ئامێزی گرتم:
(ئای کوڕی خۆشەویستم.. کوڕەداماوەکەم..)

# نوستووی بەر باران

**خەسرەوی گوڵسورخی**

دەستێ لە نێوان چەقۆ و دیوارە
دەستێ لە نێوان چەقۆ و دڵ نییە!
ئا ، ئاوا بەبێ پێ
لە پێ پلیکانەکاندا خلۆر دەبمەوە..



لەیلای من هەمیشە لە پشت پەنجەرەدا دەنوێ و
باش دەزانێ
کە من سپێدە دەمان
بێ دەست دێم و
دەسەڵاتی کردنەوەی پەنجەرەم نییە..

زیخی دەم کەنارەکانی (عومان)
رەنگ ناگۆڕن
ئەوە گۆنای منە
رەنگی دەشتی سووتاوی هەڵگرتووە..

کە تۆ، بێ پەنا
لە نێو دەریادا دەبینم،
دەستێ لە نێوان چەقۆ و دیوارە
دەستێ لە نێوان چەقۆو دڵ نییە!





نوستووی؟ نەء بێدارییی؟
ئایا تۆ خۆر
بۆ شار دەبەی،
تاکو گڕ لە کۆڵانە نوستووەکانی بەر باران و
چیمەنە شێدارەکانی نێوانیان بەردەی؟
تا هەردوو بەری رووبار بزانێ
هەرگیز ئاگر
لە ژێر خۆڵەمێشدا نانوێ..

له ژێر ڕێژنەی بارانی چەقۆیێ ڕووت
دەزانم–تۆ کراسێکت دەوێ–دەزانم
تا بۆ کەنار بێیتەوەو
پەنجەرەکان،
ڕووبەڕووی سپێدە والاکەی..

من بە ڕەشایی دووچاوی ڕەشی تۆ، دەنووسم:
لە هەر لایەکی ئەم باخچەیەدا
دەستێ هەمیشە چاوەڕوانی دەستێکی ترە
چاوێ هەیە هەرگیز ناچێتە خەو..



# فرمێسکێ لە گوزەرگای مێژوودا

**فەرەیدوونی موشیری**

لەو ڕۆژەی
کە دەستی حەزرەتی(قابیل)
لە خوێنی حەزرەتی (هابیل) دا سووربوو..
لەو ڕۆژەوە، منداڵەکانی(ئادەم)
کاکڵی پەیامی پڕ ئیمانی خوا
ژاری تاڵی دوژمنایەتی، لە خوێن جۆشاندن
گەرچی (ئادەم)یش زیندوو بوو
ئادەمیەت مرد.

لەو ڕۆژەیدا (یوسف)
بە دەستی براکانییەوە خرایە بیر
لەو ڕۆژەوەی بە شەق و خوێن
شورەی(چین) یان دروست کرد
ئینسانییەت مردبوو..



لە دواییشدا، دنیا پڕ بوو لە ئینسان و
ئەو ئاشەش هەر گەڕاو هەر گەڕا...
چەندەها سەدە بەسەر مەرگی(ئادەم)تێپەڕی
بەداخەوە
ئادەمییەت نەگەڕایەوە..

ئەم چەرخەی ئێمە،
ڕۆژگاری مەرگی ئینسانیەتە
سنگی دنیا لە چاکەکاریی خاڵییە..
باسکردنی:
سەربەستیی..پاکیی..مروەت..شێتییە!
باسکردنی:
موسا..عیسا..محەمەد..نابەجێیە!
ئا ئەم چەرخەی ئێمە،
چەرخی تیخێکی ئەستوورە.

من لە سیس بوونی چڵێ گوڵ
لە نیگای کپی ناڵێ بیمار
لە هاواری مەلێکی ناو قەفەس
لە خەمی مرۆڤێکی لە زنجیرا سندمکراو
تا کاتێ جەلادەکەی لێی دەگەڕێ..!
فرمێسک لە چاو و کینەم لەگەروودا ماوە..
بە درێژایی رۆژگار،
ژارم دەپیاڵە دایەو ژاری ماریش لە گۆزە
بە مەرگی ئەو چۆن باوەڕ بکەم؟!

قسە لەسەر سیس بوونی گەڵایێ نییە
وای، ئەوە دارستانان دەکەنە بیابان..
دەستی خوێنمژان
لەبەر چاوی خەڵکی دەشارنەوە..
هیچ گیاندارێ بە گیاندارێکی تری رەوا نابینێ
ئەوەی کە ئەو نامەردانە،
بە گیانی مرۆڤی دەکەن..





قسە لەسەر سیسبوونی گەڵایێ نییە
وای دابنێ، مەرگی مەلێکی ناوقەفەس
مەرگ نییە..
وای دابنێ، چلەگوڵێ لەم جیهانە شین نەبووە
وای دابنێ، لە ئەزەلەوە:
دارستانەکان بیابانی وشک و برنگ بوون..
لە نێو ئەو مرۆیانەی،
بەرگەی هەموو کارەساتێکیان گرتووە..
قسە لەسەر مەرگی خۆشەویستییە..
مەرگی عیشق..
گفتوگۆ لەسەر مەرگی ئینسانیەتە..



## خەنجەر

**ئیرەجی جەننەت عەتائی**

تۆ ئەگەر دەتزانی
زامی خەنجەری دەستی ئازیزان
چ دەردێک و برینێکە
لە منی ماندووت نەدەپرسی،
ئای.. تۆ بۆچی ئەوەندە تەنهای..

***نادری نادرپوور***

- **ستەم**
- **پەنجەرەیەکی خامۆش**
- **نیاز**



# ستەم

بێجگە لە گۆرەپانی پڕ ئاگرو دوکەڵ
بێجگە لە لافاوی نەخۆشیی و کوشتارو خوێن
بەدەر لە ناڵەی پڕ لە نەفرەت و تووڕەیی
بێجگە دۆزەخی سەرنگوون و وەرگەڕاو
بێجگە ڕەشەبا ، کە لەسەرخۆ
سروودی خەمەکانی
بە گوێی بیابان دەخوێنێ
بەدەر لە تۆڵەی تاڵ و کاڵ
پێم بڵێ ئەی دڵ، چی بە پیاو ماوە؟

ئێوە ئەی میرەکان..!!
ئەی گەورەکان!
ئەی ئەوانەی لە بڵندیان دانیشتوون!
ئێوە خاوەن کۆشک و بێ خەمەکان!
ئێوە ئەی هەموو جەنگاوەرە داناکان..
نازی چی بەسەر داستانەکانی مێژووەوە دەکەن؟
پشتی چی بە زۆردارانی سبەینێ دەبەستن؟
بمرن! ئێوە سزاتان مردنە..
بمرن! چونکە ئێوەن دەردو ئافات..

لەوە دەترسم ئاگرپژێنەکان
ڕۆژێ زاری خوێنینی خۆیان بکەنەوە..
ترسم لەوەیە، دەریای سەرشێت
خوڕەوشت و نەریتەکان بەجارێ سەرنگون کات..



هەموو ماڵ و شارو کۆسارەکان
تێک وپێک داو
لە مەشخەڵی کینەدا بیانسووتێنێ..
ئاسمانە شینەکان لە یەکتری بپچڕێنێ و..
ئەو گومبەزە تریفەیە بەربێتەوە..

سەیرە! لەو تاریکەشەوە بەسامەدا
خوا دەرگایەکی لێ کردمەوە..
من لەو دەرگایەوە،
لەسەرخۆ تەماشام کرد:
لەهەر گۆشەیێ، لاشەیێکی بێ سەرم دی..
تۆ ئەی هەموو سەرزەمینی گێتی!
ئەوە چ ئازادییەکە بە ناڕەسەنەکانت بەخشیوە.

دایخە!
چۆنی بە چاکی دەزانی ڕێی لێ بگرە!
جیهان لە گوناهەکانی بشۆرەوە..
زەمین لە قینی نهێنیدا دەتوێتەوە!!
قینێکی وەک تاریکەشەو..

خۆشن ئەوساتە تاڵ و ئەو ڕۆژە شیرینانە
کە قینی ئەو بە گوناهان سزا دەدا..
وەڕس بووم، لەو هەموو خۆخواردنەوەیە
وەڕس بووم..
ئای کە ژیان لەگەڵ ڕەشاییدا چەند خۆشە..

سروشت نوقمی خاک و خوێن بوو..
شارستانیەت گەر ئەمە بێ
دەبێ دڕندەیی چی بێ؟؟



# پەنجەرەیەکی خامۆش

تۆ هەموو خۆر ئاوابوونێ
ئەڕوانیتە ژوورەکەی من..
ئەفسوس، پەنجەرە خامۆشە، ماڵ تاریک
تۆ هێشتا یادی من
لەودیو مینای پەنجەرەکەوە دەبینی..
لە تۆ دوورە، لێ لە دڵتەوە نزیکە..



هێشتاکە یاریی با ، پەردەکان دێنێتە جووڵە
بەداخەوە کەسێ لەو دیو پەردەوە نییە..
لەو ئاگردانە کۆنەدا، ئاگر بڵێسە ناسەنێ
ئا لەو ژوورە چۆڵەدا، ویزەی باڵی مێشیش نایێ..

هێشتا گەڵای وشک هەڵاتوو
لەسەر ڕەفەکان کەوتووە..
نیشانەی هەموو گوڵە بابردووەکانە!!
پارچەی ئەو وێنە کۆنانەش
کەوا لەسەر ئەرز کەوتوون
گەواهی هەموو ڕۆژگارە لە یاد چووەکانن..

لە دەروونی ماڵەکەی ئێمەدا
هەناسەی گەرم و گوڕ نییە..
لە دەروونی ماڵەکەی ئێمەدا
ساردیی لەیەک جیایی هەیە..

لە دەروونیماڵەکەی ئێمەدا
ئاهەنگی دۆستان ناگەڕێ
لە دەروونی ماڵەکەی ئێمەدا
مەرگی ئاشنایانە..
هەموو شەوێ لە هێرشی خەیاڵدا،
لە بێدەنگی ماڵدا
زایەڵەی گەرمت بە گوێ دەبیستم
گۆرانیی بە گوێی مناڵە گریاوەکان ئەچرپێنێ
هێشتا ئەو گۆرانییە من لە خەو هەڵئەستێنێ.

تۆ هەموو خۆر ئاوابوونێ
ئەڕوانیتە ژوورەکەی من
ئەفسوس پەنجەرە کپە،
ماڵ تاریکە..
خەیاڵی کێیە لەو دیو مینا بنەوشەییەکان
لەتۆ دوورە، لێ لە دڵتەوە نزیکە..



## نیاز

لە ئامێزی تۆدا دەمرم..
لە ئامێزی سپیی پڕ بەهاری تۆدا
لە ئامێزێ کە ماتەمینی لێ دوورە..
لە ئامێزێ، مەمکی پاکی چاوگەی نوورە..

تۆ لەگەڵ من بە.. لە بەڵایان دڵنیابە..
تۆ لەگەڵ من بە..
من تۆم وەک پیاڵەیەکی پڕ لە تینوویەتیی دەوێ..
لەهەر هەناسەیێ.. هەر هەوەسێ..
لەهەر دەس لە ملانەیەکدا
وەک چاوی پڕ نیگای زۆنگاوە دوورەکان
کە شەوانە بێدارن و لە بۆسەی (با)ی راگوزەردان
تۆم دەوێ..

تۆش وەک من بە، لەگەڵ من بە..
پڕ بە لە(کینە) بۆ دوژمن
گیانە نوقمم کە لە ویژدان
بمخەرە ناو ئاگری هاوارە کپەکان..
بە وێنەی ئەندامی سپیت، ئاشنام کە!
بە تروسکەی چاوی رەشت،
روناهیم بەسەردا ببارێنە..



تۆم بە هەموو خەمی پاکمەوە خۆش دەوێ..
لێم گەڕێ با لێو لەسەر لێو مەستی تۆ تۆخترکەم.
ئەی خۆری گەرم و ژیانبەخش،
من لە ئامێزی تۆدا دەمرم..
لە ئامێزی سپیی پڕ بەهاری تۆدا
لە ئامێزێ کە ماتەمینی لێ دوورە
لە ئامێزی مەمکی پاکی چاوگەی نوورە..

*(م. ئومێد)*

- **خەم**
- **ساتی یەکتر بینین**



# خەم

نەچرای چاوی پیرە گورگ
نە هەناسەی نامۆی کاروانی گومڕاو ماندوو..
جێماو لە دەشتی خامۆش و بێ پایانی
بەر بارانێک
چەند سەعاتە
بەسەر ئەم شەوە شێت و خەمناکەدا دێتە خوارێ..
دڵی شەویش دەشت ئاسا ، پەژموردەیە!

له شەوی دێوانەو خەمناک..
بەهەموو لایێ..
وەک پەردەیەکی زنجیربەند
بسکە تاڤگە هەڵواسراون..
جێماوی دەشتی بێ پایان
لەبەر باران
ئاه.. سەعاتەهایە
ئەم هەورە رەشە دڵگیرە،
بێ هەست و خوست دەپڕووشێنێ،
نە دەنگی سمی ئەسپی رێگرتوو و تەنها
نەگڤەگڤی بای سەرگەردان
نە چرای چاوی پیرەگورگ!!



## ساتی یەکتر بینین

ساتی دیدار نزیکە..
دیسان ئەمن شێت بوومەوە
دیسان دڵم، دەستەکانم دەلەرزێ
گۆیا دیسان لە زەوقێکی دیکە دام
ئاه، (با) بسکی لووسم دەشێوێنێ
ئاه، ئەوا تیغ کتوپڕ روومەتم دەڕووشێنێ
نەکەی ئابڕووم ببەی ئەی دڵ!
ساتی یەکتر بینین نزیکە..





# ئەی ئومێدی پیرۆزی من

**عاتیفەیێ گورگین**

چاوەکانم پڕن لە وێرانەی
شارە دێرینەکان
شاری نێوان ڕوتیی و
وێرانەی بەردین..
وەک کەزیە رەشەکانم تاریک..
ئەوەتان لە بەرابەری مندا
خەو بردوونیەتەوە..

(بۆچی لە ئاست هێزی یەکگرتنی مندا
نابووت دەبی)و
بەو ئاسانییە،
من دەدەیتە دەستی بایێ
لە خیانەتکاریی خەوەوە دێ!؟
ئاسۆ لە نێو چاوەکانما پاڵ کەوتووە..
هەرچی بخوازم دەستی دەخەم..
من بێ ئاسۆیش، دەڕوانمە تۆ

ئەم رووبارە
ئەم ژانەم
سنووری چیرۆکە کلوم دراوەکان نازانن..
چاوەکانت پڕ بوون.. لێیان دەڕژێ!

کاتێ سەرپەنجە ناسکەکانی تۆ
نەشونمای کەزییەکانم دەخەوێنێ
من دیماهی تۆ
لە بروسکەی هەر نیگایەکتا، تێ دەگەم



کاتێ تۆم،
ئا لەو سپێدە کپە دیت
یەکێ لە دەروونی مندا
هاواری لێ هەستا
تێگەیشتم، بێجگە لە تۆ
ئەمن تاوم بە هیچی تر لێ هەڵنایێ..

ئەوەتا لە پشت پەنجەرەوە
یەکێ بانگم دەکا..
بینیم تۆی، بە دەستی زبرەوە
لە سپێدەوە دێی..
وەستام و
دەستەکانم والآ کردووە.

## بیرکردنەوە

سوعاد تاشەر

پێت هەبێ و
نەڕۆی
چاوت هەبێ و
نەبینی
زمانت هەبێ و
لاڵ بی
کەواتە نەختێ بیرکەرەوە
جیاوازی تۆ و بەرد چییە؟



## سفر

لەسفرەوە دەستی پێکرد
سفرو سفری دیکەشی بەسەر وەنا
ئێستا خاوەن سامانێکە
پڕ لە سفرە..

## سەرەتا

ئاوێنەکان هەست بە گۆشەگیریم دەکەن
پاشان جلەکانم
پەنجەرەوە
پێخەفەکە..
کە وای لێ دێ تۆ هەست دەکەی
هەموو شتێک دوایی هاتووە!

ئومێت یاشار

# وێنە

**گریگۆری کۆرسۆ**

بەدیواری ژوورێکی ڕاخراوی خەمباردا
وێنەی کچەکانی منالّیم هەلّدەواسم
بەدلّێکی شکاوەوە دادەنیشم..
ئانیشک دەدەمە سەرمێزەکە
ڕادەمێنم و دەستم بەڕوومەتێوەیە:
سەیری چاوی پڕ شانازیی (هێلین) و
دەمی (ژان)ی گشت و
قژی زێڕینی (سۆزان) دەکەم.



# شار

**کوستەنتینی کەفافی**

وتم: بۆ خاکێکی دیکە دەچم، بەرەو دەریایەکی تر
شارێکی لەم شارە چاتر هەیە..
هەموو هەولّێکم بێ هوودەیە، دلّم وێنەی مردوو گۆڕکراوە
تاکەی خەیالّم لەخەم دابێ..
چەندی چاوم هەلّبڕی..
چەندی تەماشای دەوروبەرم کرد
وێرانەی ڕەش داگەڕاوم لە ژیانمدا دی

که چەندین ساڵ
بەسەرچوون و ڕمان و پەرش بوون..
وڵاتی ترو دەریای دیکە نادۆزیەوە..
شارەکەت بەدواتەوەیە..
هەر لە هەمان ئەو شەقامانەدا دەبی
لەهەمان کوچەشدا پیریت دەگاتێ
لەهەمانماڵیشدا سەرت سپی دەبێ..
هەمیشە دەگەیتەوە ئەم شارە
هیوا بۆ جێی دی مەخوازە
هیچ پاپۆڕێکت بۆ نییە.. هیچ ڕێگایێ
مادەم ژیانت لێرە، لەم گۆشە بچووکەدا تێکچووە..
لەهەر جێیەک دابی وێرانەیە..



# چوار ڕیان

**فازڵ عەززاوی**

– ئەو کەشتییەی نەگەییە جێ
–ئەو خانووەی دروست نەکرا
– ئەو ڕێگایەی نەگرایە بەر
– ئەو نامەیەی نەگەیشت
– ئەو بیرەی لێ نەدرا
– ئەو درەختەی نەڕوێنرا
– ئەو جگەرەی نەکێشرا
– ئەو قاوەیەی نەخورایەوە
– ئەو مردنەی نەهات و
– ئەو ژیانەی دەست پێ نەکرا

لەهەر کەشتییەک ڕێبوارێک خۆی دزیوەتەوە
لەهەر ماڵێکدا چەند یادگارێکی ونبوو
لەهەر دێیەک کاروانێک دەگەڕێتەوە
لەهەر نامەیەکدا ڕستەیەکی لەبیرکراو
لەهەر بیرێکدا یوسفێک دەگری
لەهەر درەختێک سێوێکی حەرامکراو
لەهەر جگەرەیەکدا هیندییەکی سوور
لەهەر قاوەیەک تاڵیی
لەهەر مردنێکدا فریشتەیەکی مەست
لەهەر ژیانێکدا تەرمنێژ چاوەڕوانن

لەوێ لە پۆستی سنوور
فەرمانبەرێک هەیە چاک دەتناسێ
تەوقەی لەگەڵ بکە، یان بۆی پێبکەنە..
پاشان بەهێمنی تێپەڕە.



## ساڵی نوێ

**ڤالنتین سۆرۆکۆن**

دەمەو ئێوارەی ساڵی نوێ
وەک مانگی سەر سەهۆڵبەندان
سەری باپیرەم، دەڵێی بەشەکر داپۆشراوە..
درەختە سەوزەکانی پاڵ شوورە بچووکەکە دەبینم،
لە ئەندێشەیەکی نادیاردا ونن!

شادی و شەکەت بوون.. نووستوو، نوقمی خەو
شار هێمنە، پێڵوەکانی لێک ناوە..
تەنها لەهەندێ کات نەبێ،
کە ڤرەڤری شەمەندەفەرە
جوانیی ئاسۆی ساڵی نوێ دەشێوێنێ..

# پەریا

**ئەحمەدی شاملو**

یەکێ بوو، یەکێ نەبوو
لەژێر گومبەزێکی شینا،
بانگی شێوان، ڕووت و قووت
سێ پەری ڕۆنیشتبوون
بە کوڵ دەگریان پەرییەکان
وێنە هەوری بەهاران، فرمێسکیان هەڵدەباران
کەزیەکانیان، قەدی کەوان، ڕەنگی شەبەق
لە درەختی کەمون شکۆفەیان زیاتر دەرکردووە
لە ڕەنگی شەبەق تۆخترن.
بەرەو ڕوویان، ڕێک شاری کۆیلەی دیلە
پشتەوەشیان ساردو سڕ قەڵای ئەفسانەی پیرە



لە ئاسۆوە زرنگ زرنگ، زرەی زنجیر دەهاتە گوێ
لەو دیوەوەش، لەناو قوللە، ناڵە ناڵی ئیشکچییێ
-فریشتەکان! برسیتانە؟
فریشتەکان تینووتانە؟
فریشتەکان ماندووبوون؟
یا باڵندەی پەڕبەستەن؟
چییە ئەوهایهایەتان
وای وای و گریانەتان؟
فریشتە چیان نەدەگوت، هەر دەگریان
وێنەی هەوری بەهاران، فرمێسکیان هەڵدەباران

- فریشتە نازەنینەکان!
چیتانە ئاوەها دەگرین؟
لەم بیابانە دوورەدا
ئا بەم بانگی شێوانە
ناڵێن کە بەفرێ دەکەوێ؟
ناڵێن بارانێ دەبارێ؟
ناڵێن گورگ دێ و دەتانخوا؟

نالێن دێو دێت و دەتانکا بە یەک پاروو
ئێوە ناترسن پەریەکان؟
نایەن بۆ شارەکەمان؟
شارەکەی ئێمە دەنگی دێ.. زرەی زنجیرەکانی دێ..

فریشتەکان!
بالای ڕێکم ببینن
ئەسپی سپیی من ببینن
ئەسپی سپیی ناڵ زیوین
کلک و بژی ڕەنگ هەنگوین
تیژڕۆ خوشبەزۆکەی من
ئاسکی دەمار ئاسنی من!
پەل و گەردن
بای تفنکانی ببینن
ئەمشەو لەشار هەرایە
مۆڵگەی دێوان داخ کراوە
ئادەمیی میوانمانن
بە بەزم و هەرا دێنە شار



دۆڵ و زورنایێ لێ دەدەن
دەلەیزن و دەلەیزێن
خونچەی پێکەنین پەرش دەکەن
نوقڵی بیابان دەرێژن..
های دەکێشن.. هوی لێ دەدەن!
- شار بووە جێگای خۆمان!
جێژنی ئادەمییانە، دێو بەگلەیین
دنیا، دنیای خۆمانە، دێو بە گلەیین
سپیەتی پاشایە، دێو بە گلەیین
ڕەشایی ڕووسیایە، دێو بە گلەیین

فریشتەکان!
ئیتر ئەوا خۆر لە ئاوابوون دایە
دەروازەی قەلاداخراوە
بۆیە تا زووە هەڵستن
سواری ئەسپی من بن
دەگەینە شاری ئادەمیان، تەماشاکەن دەنگێ دێ
قڕ قڕ، پچڕانی زنجیری کۆیلان دێ

ئەدی، زنجیری گران و ستوور، ئەڵقە بە ئەڵقە، لابەلا
هەڵدەوەرێن لەدەست و پا
رزیو لە باڵ یەکدی دەردێن
دێو و درنج بەدبەخت دەبن

سەر بە دارستاندا بکەن، دارستانێ بە دڕکستان دەبینن
سەر بە بیاباندا بکەن، تراویلکەو (شۆڕزارێ) دەبینن
لەباتی وەش لەشاری ئێمە(ئاخ نازانن فریشتەکان!)
دەرگای قوللان دەکرێنەوە، کۆیلەداران ڕیسوا دەبن



کۆیلەکان ئازاد دەبن،
ئاوا دەبنەوە وێرانە
هەر کەسێ خەمێکی هەبێ
خەمەکەی لە بن گڵ دەنێ
حەسیر دەبن بە مافوور
دیلەکان ئازاد دەبن
دیل داخ لە دڵن
دەست بۆ داسەکانیان دەبەن
دەبنە لافاو شڕ شڕ شڕ!
دەبنە ئاگر گڕ گڕ گڕ!

لە دڵی شەودا کەناشیرنە
ئاگرباری چەند جوانە!
ئاگر! ئاگر! چەند چاکە
ئێستا کە بانگی شێوانە
چی وا بەشەو
بە جۆشی گەرمی، نەماوە
های ڕاپەڕین
لە حەوزی زیوین دەرقوڵێن..

نوکە کۆیلەکان وەستان، ڕووی چراکان وەربگێڕن
بکەونە بەرگیانی شەو، دڕ بە تاریکایی بدەن..
مامۆ زنجیران دەچنێ، با ئاپۆرەی خەڵکی ڕێ دەن[1]
بیهێننە نێو مەیدان و
لە جێیێ هەڵیپەڕێنن
بیکەن بە بایی یەک پوول
دەست لە نێو دەستی یەک بنێن



لە دەورەی یار بکەونە سەما..
«حامۆک میرۆلەی هەیە، هەستن و دانیشن» لاسایی بکەنەوە[2]
«سنوقۆکەو قفڵیان هەیە، هەستن و دانیشن» لاسایی بکەنەوە
فریشتەکان ئیتر بەسە های هایتان
گریان و واوایتان!
هیچیان نەگوت، بە کوڵ دەگریان فریشتە
بە وێنەی هەوری بەهاران فرمێسکیان هەڵدەباران،

فریشتە خەت خەتیەکان[3]
ڕووت و قووت و پاپەتییەکان
شەوانی چلەی بچووک
لەژێر کورسیدا قرچ قرچ
برێشکەمان دەقرتاند و بارانیش دای کردبوو
دەنگی لە سولاوکە دەهات
نەنەگیانیش هەقایەتی دەگێڕانەوە
قسەی پڕ لە نهێنیی
چیرۆکی فریشتەی سەوزو فریشتەی زەرد.





چیرۆکی خاتوونی شای پەریان..
ئەوە ئێوەن فریشتەکان
هاتوونەتە دنیای ئێمە
ئێستاکە تەماح گرتوونی کەف و کوڵتانە
کرکرِ بێ دەنگ خەم دەخۆن
دنیای ئێمە خاڵ خاڵییە، دەردو خەمی تێدا نییە،

دنیای ئێمە چیرۆک و سەربردە نەبوو
پەیامێکی سەرمۆر نەبوو
هەر کێ بیەوێ بزانێ
دنیای ئێمە ئاشکرایە
دنیای ئێمە دڕکاوییە
بیابانی پڕن لەمار
هەر کەس کاری بەوی ترە
دڵی با خەبەر، ئاگادار..
دنیای ئێمە بزورگە

پڕ لە چەقەڵ و گورگە
دنیای ئێمە- هێ هێ هێ
ئەودیو ئاگر- لێ لێ لێ
ئاگرت دەوێ- لە باڵا کرمۆڵە بووە
تا پاژنەی پێت، دەستت لەخۆ شتووە
دنیای ئێمە ئەوەیە
بتانەوێ و نەتانەوێ هەر ئەوەیە!

باشە فریشتەی چیرۆکان
باڵدارە باڵ شکاوەکان!
ئاوتان نەبوو؟ دانتان نەبوو، چایی و نێرگلەتان نەبوو؟
کێ پێی گوتن کە بێن بۆ دنیای ئێمە، دنیای واوەیلای ئێمە..
کێ پێی وتن قەڵای چیرۆکتان وێڵ بکەن
کێشە بۆ خۆتان دروست کەن..
هیچیان نەگوت، بە کوڵ دەگریان فریشتە



وێنەی هەوری بەهاران، فرمێسکیان هەڵدەباران..
دەستم برد بۆ شانیان
یەکالایان بکەمەوە
قیژاندیان هاواریان کرد، جادووگەر بوون، بوون بە دوکەڵ
ژۆرداچوون، تاریک بوو، ژێرداگەڕان، درەوشانەوە.. پیربوون،
بوون بە گریان، بوون بە ڕۆح، بە زەردەخەنە، بوون بە خان،
بەزیندانیی، بە کەڵەشێری سەرکەندە، بوون بەمیوە،
بەدانی میوە، بوون بە هەناری سەربەستە،
بە ئومێد بە یەئس
بوون بە ئەستێرەی نەحس
وەختێ دییان ئەستێرە
کاری بەسەر منەوە نییە
دەبینم و حاشا دەکەم، تەماشای گەمەیان دەکەم
سەرسام و گێژو وڕ نابم، بە جادووگەر نابم بەبەرد

یەکێ بوو بە گۆزەی شەراب
یەکێکیش بوو بە دەریای ئاو
یەکیش بوو بە کێوێ برنگ و

چەقییە ئاسمان..
شەرابەکەم هەڵقوڕاند..
کەوشەکانم توند کردن
لەدەریام دا تەڕبووم و
پەڕیمەوە
ڕام کرد، ڕام کرد
گەیشتمە سەر شاخ
لەوبەری شاخ، سازو ئاوازیان لێ دەدا
(ترینگ ترینگ شاد بووین..
لەدەست ستەم ئازاد بووین..
خۆرەخان تاوی هاوێت
فەردەی برنجی دەئاوێ کرد)

خۆرەخاتوون بفەرموو
لەو بەرزاییە وەرە خوارێ
ئێمە زوڵم و زۆرداریمان تێک شکاند
(ئازادیی)مان کرد بە قیبلە!



لەو کاتەی خەڵکی ڕاپەڕین
ژیان بووە هی خۆمان
لەشادی بێزارنابین
چیتر بەندەو دیل نابین

بەرزو نزم بووینەوە
لەحەوزی زیوین کەوتین
سێوی ئاڵتونمان رنی و
بەماڵی خۆمان گەیشتین

سەرکەوتین دۆ بوو
چیرۆکی بێ ترس درۆ بوو
ژێردا گەڕاین، ماست بوو
چیرۆکمان ڕاست بوو
چیرۆکی ئێمە گەیشتە سەر
مێردەزمەش نەگەییەوە ماڵەکەی
هەڵبەزین، دابەزین
زنجیرەکانمان هەمووی پێچایەوە

1) مامۆ زنجیران دەچنێ، کەسیەتێکی دوژمنانەیە لەیارییەکی کۆنی منداڵاندا.
2) حەمۆمک مێرولەی هەیە ئەوە لە یاری نا ، بەڵکو راستی جۆرە
ئاگادارکردنەوەیەکی سادەدڵە کە لە نێو هاوتەمەندا باوبووە،
ئەوان دەستیان لە نێو دەستی یەکتر دەناو
دەستیان تێک دەگرت و حەلقەیەکیان دروست دەکرد
لەکاتی وەرچەرخاندا دەیانگوت: حامامۆک مێرولەی هەیە،
ئەوانی تریش لەوەزمدا دەنگیان لەدەنگی دەدایەوەو
دەیانگوت هەستن و دانیشن
بۆ دێڕی دووەمیش هەر بەو جۆرە کە هەندێ
دەیانگوت سندوقۆکەو قفڵیان هەیە.. ئەوانی دی
لێیان دەگێڕایەوە: (هەستن و دانیشن..)
ئەوەش وەکو وتمان ئاگادارکردنەوەیەکی پاکدڵانەیە.
3) پەرییە خەتخەتییەکان: ڕاستییەکەی ئەوە دەستەواژەیەک بوو کە کوڕە چکۆلەکەم لەکاتی نووسینی ئەم شیعرەمدا دووبارەی دەکردەوە، منیش یەکجار پەسندم کرد، کە ئەو بە چەند خەتێک تەعبیری لێ دەکرد دواییش بەکارم هێنا.

**تێبینی:**

**1- ئەم شیعرە لە ئەسڵی فارسییەوە کراوە بە کوردی، بۆ دەقی فارسی بڕوانە:**

**ئەحمەدی شاملو، هوای تازە(کۆمەڵە شیعرێکی هەڵبژاردە) لە بڵاوکراوەکانی (نیل)، تاران، چاپی پێنجەم 1355 ی کۆچی هەتاوی لاپەڕە 172-182.**

**2- شاملو شیعرەکەی پێشکەشی(فاطی البطحی) کردووە.**

**«وەرگێڕ»**



# کۆچی خۆشەویستم

**هانریخ هاینی**

ئەو نامەیەی بۆت نووسیوم
جێگای هیچ مەترسی نەبوو!
تۆ ناتەوێ، لەمەوبەدوا خۆشت بوێم!!
بەڵام نامە درێژەکەت،
کە بەوێنەی پەرتووکێکی بچکۆلانەی دوانزە پەڕیی
بەوشەی ناسک نەخشاوە..
بۆ جیابوونەوە نەهاتووە..
مرۆڤ گەر جیابوونەوەی بوێ..
نامەی، بەم شێوەیە نابێ..



# نانی ڕۆژانە

**ماکسیم تانک**

هەمیشە زێدو واری منالّیم لە خەیالّە،
وەرزی درووێنەو خەوی ئارام..
خولیامە خەڵکی هەموو واریان هەبێ و
بەهاران درەخت گوڵ دەربکەن..
ئەم خولیایەش نانی ڕۆژانەمە..
هەندێ جار نانەکەم، بە هۆی تێکەڵبوونی بە خۆڵ تاڵ بووە
هەندێ جاریش بە فرمێسک سوێر بووە
جاریش هەبووە بە باڕووت گەرم بووە..
بەڵام هەمیشە بەتام و بۆ..
بە تایبەتی کە لەگەڵ هاوڕێکانم دابەشم کردووە

که به گه‌ڵ کاروان ده‌که‌وم
له‌و نانی ڕۆژانه‌یه زیاتر
له هه‌گبه‌که‌م دامه‌نێن
له‌وی زیاتر له‌سه‌ر خوانه‌که‌م دامه‌نێن
کاتێ له‌گه‌ڵ میوانه‌کانمدا له‌به‌ری داده‌نیشم
که ده‌شمرم،
له‌وی به‌ده‌ر له‌سه‌ر سنگم دامه‌نێن



# پاككردنه‌وه‌ی ڕۆح

**تادیۆش ڕۆجیفیچ**

شه‌رم له فرمێسکه‌کانتان مه‌که‌ن
شاعیره لاوه‌کان!
شه‌رم له فرمێسکه‌کانتان مه‌که‌ن
چه‌شه له‌مانگ، له هه‌یڤه شه‌و
له دڵداریێ پاکژو هوزاری بولبولان وه‌رگرن..
له هه‌ڵکشاندا به‌ره‌و ئاسمان مه‌ترسن
ده‌ست درێژکه‌ن ئه‌ستێره‌کان بگرن
چاوان به ئه‌ستێران بچوێنن..
با دیمه‌نی گوڵه‌کانی به‌رایی به‌هارو
په‌پووله‌ی پرته‌قاڵی و
هه‌ڵاتن و ئاوابوونی خۆر کارتان تێ بکه‌ن..

دانوولان بە بەرکۆترە ئارامەکاندا وەرکەن
لە گوڵ و ئاژەڵ و کسۆک و شەمەندەفەران خوردبنەوە
لەوکاتەدا زەردەخەنەتان لەسەر لێوان بێ..
باسی نموونە بەرزەکان بکەن
سروودی لاوان دابدەن..
بڕوا بە ڕێبوارانی غەریب بکەن..
باوەڕ بە جوانیی دێنن کە هێشتا ساویلکەن
باوەڕ بە مرۆڤ دێنن کە هێشتا سەرەڕۆن و هەڵپەتانە،
شەرم لە فرمێسکەکانتان مەکەن
شاعیرە لاوەکان، شەرم لە فرمێسکەکانتان مەکەن..



# دار گوێز

**شیعری: ستیڤان ئۆکتاڤیان**

تۆ هێشتاکە
سێبەر لە شوێنە دڵگیرەکاندا دەکەی..
تۆ هێشتاکە
گۆشەیەکی تەواوی ئاسمان،
لە باوەشی خۆت دەگری..
دەڵێی پاسەوانێکیت و

لەناو جەرگەی ئەفسانەکانەوە هاتووی..
ئەی دارگوێزە بەرزەکە!
تۆ هەمان لق و چڵت،
بەسەر ماڵی باوکیشمدا کێشاوە..
هەر لە دێر زەمانەوە نێوچاوانت مانای ترسی نەزانیووە
کە ڕەشەبا هێرشی بۆ هێنابی،
تۆ بەرەنگاری بوویتەوە..
ئاە گەر ئەتتوانیی سەرلەنوێ
باوەش بۆ ڕۆژگارانی زوو بکەیتەوە..
باوەش بۆ ئەو وەرزانەی
هێشتا وەکو چەند ڕاگوزارێکی شیرین،
لە یادمن و میهرو سۆزی لاوانەوەی منداڵیمن..
ئاە گەر ئەتتوانیی سەرلەنوێ،
ئەستێرەی مناڵە خوێن گەرمەکان کۆبکەیتەوە
کە وەک جنۆکە لەشایی و هەڵپەڕکێکاندا
دەخولانەوەو..



لە گەڵایە سیس بووەکانی پایزانت،
دەستە چیلەیان ڕێک دەخست..
بەڵام کوان؟
کوان ئەو مناڵە ڕووخۆشانەو کوا پێکەنینیان؟!
ئەوەتا (ڕێ)یەکان بیابانن، وشترالوکیان تێدا ڕواوە..
بیابانێ،
دەمێکە دالآنی ماڵەکەمانی کردۆتە هەواری خاڵی
ئێستاش ئەوەتا ڕێیەکانی تێدا دەژیت..
ئەو پیرەمێرانەی لەگەڵ باوکم
لەبەر سێبەری تۆدا کۆڕیان دەبەست..
ئەو گەلآیانەیش کە پێشڵیان دەکردن..
بوونەتە گڵ!
ئەی پاسەوانی خاوەن شکۆ، دارگوێزەکە!
تۆی تەنها ، تۆی هەرگیز سەرت دانەنواندووەو
چەند ساڵە
کەلاوەی ماڵی باوکمت لە ئامێزی خۆت گرتووە
کەلاوەیێ کە ئاوازی گۆرانییەکانی ئەمڕۆمە..

## گۆرانییەکی کاڵاو بۆ کریستینای خۆشەویست

خۆشەویستە بچکۆلەکەم..
سیمای گەرمۆکەو شەرمنت،
لە پانایی دەستەکانما.. ئۆقرە ئەگرێ..
تۆ لە هەموو شتێک، رادەمێنی!
چاوەکانت هێشتا دنیایان نەدیووە
لەهەموو شتێک ورد دەبنەوە..
لێوەکانت کە هێشتا دەقیان نەشکاوەو ماچ نەکراون
بڕوا بە هەموو شتێک دەکەن..
لێوەکانت، دەمترسێنن..
لەکاتێکدا باوەشیان بەیەکدا کردووە!
سەیرم دەکەی و تێم دەڕوانی،
دەم و چاوی گەرمیشت..
لە پانایی دەستەکانما، ئارام دەگرێ..
نا گیانەکەم!
بڕوا ناکەم، ژیان ئەوەندەی خۆشەویستیت، شیرین بێت!!



## لەگەڵ کۆچ پێکراوێکدا

ئەم خاکە، بە گوێرەی تۆ تەنیا بستەوارێکە، کوڕی سەگ
بۆ منیش نیشتمانە..
دەبا بە هەناسەی بتۆڵاو زەیزەفوونەوە توڕت بدا
وەک سەرخۆشێک دەڕشێتەوە..
نان و ئومێد،
خۆشیی و ناخۆشیم لەگەڵ تۆدا بەش کرد
کەچی تۆ نەتهێشتم





بەشە دواییەکانی کتێبی چارەنووسم بخوێنمەوە..
بەڵام من گەورە دەبم و پێ دەگەم
داوای قەرزەکەیشم ناکەم
تۆش لەگەڵ ژاری کوشندە لە خوێنتدا بمێنەوە..
پێشینان دەڵێن:
گورگ چەندی تێری بکەی، چاوی هەر لە دارستانە..
بەڕاست، گورگیش دڕندەیەکی ئەفسانەییە،
داکۆکی لە ئازادیی خۆی دەکا..
ئەمن تێت دەگەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا
ڕێزێکی زۆرت دەگرم وەختێ دەڵێم:
جەزای ڕق، هەر ڕقە..
مادەم ناتوانی وەڵامی خۆشەویستی بەخۆشەویستی بدەیەوە.
بڕۆ بگوێزەرەوە!
وەک سێبەرێک کە تا هەتایە دەسوڕێتەوە..
وێنەی شەیتانێک
کە دوای ئەوەی بۆ ساتێ کورت تینوویەتیی ڕقاویی خۆی دەشکێنێ و ون دەبێ
بڕۆ بگوێزەرەوە..!

# سترانێك بۆ سەمەرقەند

**مەعین بەسیسۆ**

**لەکاتێکدا تەیموری لەنگ، دوور لە شاری سەمەرقەند، خەریکی یەکێک لە شەڕەکانی دەبێ.. خانمی ژنی، هەموو ئەندازیارانی سەمەرقەند کۆ دەکاتەوەو داوایان لێ دەکا پەرستگایەکی مەزنی بۆ دروست بکەن؛ پێشوازیی (تەیموور لەنگی) پێ بکا، بەڵام بەمەرجێک پەرستگاکە لەچەند ڕۆژێکدا تەواو بێ.. ڕاستی هیچ ئەندازیارێک نەوێرا خۆی لەم پرۆژەیە بدا، ئەندازیارێکی لاو نەبێ، ئەویش لە بەرابەر ئەوەی خانمی ژنی تەیموور لەنگ ماچێکی بداتێ.. هەرچەندە خانم تەماحێکی زۆری خستە پێش ئەندازیارە لاوەکە بێ سوود بوو.. هەموو زێڕو گەوهەرەکانی ڕەت کردەوەو بە ماچەکەوە نووسا.. ئاکام خانم، دەستی خستە سەر ڕوومەتی و ڕازی بوو بەوەی ئەندازیارەکە لەسەر دەستی لەرزۆکییەوە ماچی بکا.. بەم جۆرە پەرستگاکە دروست بوو. کە تەیموور لەنگ گەڕایەوە، پێی زانی، ویستی کەتنێک بە ئەندازیارە لاوەکە بکا، بەڵام سوودی نەبوو، ئێستاشی لەگەڵدا بێ ون بوو و نەکەوتە دەست..).**

خانمەکەم
نەلەشکرشکێنم و نە خاوەنی دەربار
بەڵام پێم دەکرێ، ئەوەت بدەمێ
شیرو خەنجەرو
هەمووتەخت و تاراجی زەوی، نەیاندابیێ



چەند ئاسانە ئەم جیهانە بە لەپی دەست سەرببڕێ
چەند ئاستەمیشە لە لێوی ئێمەوە لەدایک بێ..
چەند ئاستەمە قەپێلکی هێلکە بشکێ و
چۆلەکەیێ لە شەقەی باڵی بدا..
یا دارگوڵێ لەژێر لێفەی تەیموور بڕوێ..

خانمەکەم، جیهان منالێکە لە ئێمەدا،
وەختێ یەکترمان خۆش دەوێ.. گەورە دەبێ..
دەبێ بە دڵ، خانمەکەم!
کە شمشێر جێی دڵ دەگرێتەوە،
خۆشەویستیش دەمرێ..

پاسەوانەکانت لەژێر شوورەکانداں
بانیژەکەشت دوورە..
بەڵام من خوێنبەرەکانم، دەکەم بە پەت
عاشق دەستی بەخۆریش رادەگا
ئەوەیە موجیزەی خۆشەویستی خانمەکەم
گۆچانەکەی نەشوەشێنێ، دەبێ مار
ڕستەی دەسرۆکان،
ڕستەی دەسرۆکان لەدەمییەوە دەرناکا..
(هابیل) لەتەرمی(قابیل)دا
ناهێنێتە دەرەوە..
خانمەکەم،
جادورگەر هەرگیز نابێتە عاشق
لەوە جوانتر،
عاشقی ژنی قەیسەربی و
ناپاکی لە قەیسەر بکەی..
چ لەوە جوانترە
بەینی هەردوو چاوی قەیسەر
بدرێتە بەربالّی بولبول



ـ بمدەرە بەرگوڵ
بمدەرە بەر خەنجەر..
ـ خانمەکەم!
تەیموور ئەوەتا لەبەر دەروازەی سەمەرقەند
تەیموور خوداوەندە..
فریشتەو شەیتانەکان..
دارو دەستەو سەربازەکانیەتی..
ـ چی بکەم؟
ئەدی قەیسەری گەورەم؟
ـ بەڵام من لە پێناوی تۆدا
خیانەت لە قەیسەریش دەکەم..
هێشووی بروسک، کەزیی قژەکەت
تریفەی بروسکەی لە لێوەکانتدا هەڵبوو
هەموو مۆم و ئەستێرەی شەو،
هەموو روناهیی خۆر دێنێ..
ـ ماچم کە!
بەسەر لەپی لەرزۆکی بە گۆناوە نووساومدا
ماچم کە!

بەناوی سەمەرقەندەوە..ماچم کە!
ـ خانمەکەم ماچەکانت مردنە..
ڕەنگی ڤۆدگا ، ڕەنگی ئاوە..
وەلێ شاعیر، خانمەکەم
لە ڕووبارێکی ڕەواندا لەدایک نابێ
بەڵکو لە بروسکەیەک هەڵدەدێرێ و
دەمرێ..
قەدەری شاعیر ئەوەیە خانمەکەم:
مەدالیای قەیسەر ڕەت دەکاتەوە..
نانی قەیسەر ڕەت دەکاتەوە..
شەرابی قەیسەر ڕەت دەکاتەوەو بە خەیاڵی مەستیی
لە چۆڕێ بروسک، تێدەتەقێنێ..
بروسک دەیکوژێ و
بروسک زیندووی دەکاتەوە..

خانمەکەم!
ئەگەر ماچەکانت گەردوونێک و
شارستانیەتێک بنیات بنێن؛





داخۆ چەند گەردوون لەژێر لێفەو سەرجێیت
لەدایک دەبن؟
ڕۆژگارێ دێ
ماچ تا مردن ڕاو دەنرێ..
جێ و بالنگانی عاشقان
پیاڵەی مەی و
بەیتی شیعر ڕاو دەنرێن..
ڕۆژگارێ دێ
سەری پاسارییان دەبڕرێ و
بەشوورە شۆڕ دەکرێنەوە..
بەڵام ئەوە تەمیوورە
بەردێکە لەزەویدا ڕواوە
خانمەکەم!
بەرد چەندی ڕەگ و دەماری لێ بڕوێن
نابێ بەدرەخت
شەو هەرچەندێکی برسی بێ
ئەستێرەو مانگی خۆی ناخوا
چۆلەکەی سەمەرقەندیش



بەژێر نینۆکی تەمیووردا
دانەوێڵە هەڵناگرن..
چی بە ئەژدیهاوە ماوە خانمەکەم؟
لە چڕنووکی شکاویی و
پاشماوەی ئەفسانەکان بەدەر
چی پێ ماوە؟

چ هیلاکە ئەو دنیایەی
سیماو ڕووی چۆلەکەی هەیەو
دڵی ئەژدیها..
(چ هیلاکە.. خانمەکە..)

# لە ئێوارە شینکەڵەکانی هاویندا

**رامبۆ**

لەوکاتەیدا
بە باریکەڕێیەکاندا، گوزەر دەکەم و
لەهەردوولا،
گوڵەگەنم وێ دەکەون..
پەلکە گیایە ناسکۆڵەکان دەشێلم..
وەکو ئەوەی لەخەودابم!!
هەست بە گەرمییەک دەکەم..
قاچەکانم دادەگرن..
با شنەی با،
بەم لاو بەو لام تێپەڕێ..

قسە ناکەم،
بیر لە هیچ شتێک ناکەمەوە..
بەڵام خۆشەویستییەکی بێ کۆتایی..
لەناوەوەم کڵپە دەکا..
دەڕۆم!
بەرەو دوور
دوور، یەکجار دوور..
لەباوەشی سرووشتدا
دڵشاد وەکو ئەوەی لەگەڵ ئافرەتێکدا بم..

# کولانکەکانی یاد

ژاک بریڤێر

لەکولانکەکانی یاددا
مرۆ حەشار دەدرێ..
لە چیاکانیشیدا،
ون دەبێت..
ئەوەی گۆرانیی دەڵێ من نیم
ئەو گوڵانەن کە من دیومن..
ئەوەی پێدەکەنێ من نیم
ئەو عارەقەیە نۆشیومە..
ئەوەی دەگری من نیم
خۆشەویستییە ونبووەکەمە!!



# با گەردوون بدەینە منداڵان

نازم حیکمەت

با گەردوون، ئەگەر بۆ رۆژێکیش بێ
بدەینە منالە وردیلەکان
با بیاندەینێ یاریی پێ بکەن
وەک ئەوەی یاریی
بە دەبدەبەیێ رەنگاورەنگ دەکەن
با گەردوون بدەینە منالە وردیلەکان
با وەک سێوێکی مەزن
وەک نانێکی گەرم بیاندەینێ..
تا لەو رۆژەی دا
کەیفیان پێ خۆش بێ..
با گەردوون بدەینە زارۆکە وردیلەکان
با ئەگەر بۆ رۆژێکیش بێ
دنیا لە هاورێیەتیی بگا
زارۆیە وردیلەکان
دنیامان لێ قبوڵ دەکەن و
پێکەوە
درەختی نەمر دەروێنن

## دەریای 15 پازدان

یاشار میراج

دایە ئاوی ئەم دەریایە
بۆچی ڕەشە ؟!
ئینجا کوڕم ژیانی پازدان سپی بوو ؟
دایە شەپۆلی ئەم دەریایە
بۆچی هێندە بێ ئامانە ؟
ئینجا ڕۆڵە
نەبەردی پازدان ئاسان بوو ؟
دایکە ڕۆحی ئەم دەریایە
لەبەرچی هێندە غەمگینە ؟
کوڕم ئینجا خوێنی پازدان شادمان بوو ؟



دایە ئەم دەریایە بۆچی
هێندە بەگێژەن، تووڕەیە ؟
ڕۆڵە شێری بریندارم
ئەوە دەریای پازدانە..
باشە دایە، ئەم دەریایە
لەبەرچی ناوی پازدەیە
کوڕم پازدەن
هەوێنی سووری ئەم دەریایە.

# ماسادۆنیا

«ماسادۆنیا» وڵاتێکی ڕووتان و ژیان گرانە، گۆرانیشیان نوێشکی ئەو ڕووتەڵانەن کە تێیدا لەدایک بوون.. گۆرانیی کێویی و تراژیدین.. وێنەیان دەقاودەقی کارەساتەکانی مێژووی پێکهاتنیانە.. ئەو گۆرانیانەن گەل دایناون باس لە تاقیکردنەوە زیندووەکانی دەکات و خەمەکانی دەردەبڕێ.

حاڵی حازر، ماسادۆنیا، وڵاتێکە پایتەختەکەی شاری(سکۆپیا)یە، دەکەوێتە نێوان وڵاتانی سرپیاو بولگاریا و ئەلبانیاو یۆنان.. زمانەکەیان(ماسادۆنیە) کە دەگەڕێتەوە سەر سلافی باشووری، زۆربەی دانیشتوانی سلافین، بێجگە لە ئەلبانی و ڕۆمانی و کەم تا کورتێکی تورکیش.



سلافیەکان لەکاتی ڕۆمە بیزەنتینییەکاندا(سەدەی9و10) هاتنە ناو ئایینی (مەسیحی)یەوە، لەسەدەی چواردەهەمیشدا تورکە عوسمانییەکان بەشێوەی داگیرکەر هاتنە ناویان.

لەگەڵ ئەو هەموو بەرگری و نارەزایی و خۆڕاگرتنەشدا حوکمی عوسمانی تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم درێژەی کێشا..!

دوای شەڕی دووەمی جیهانی، ئەو وڵاتانە بە تێکڕایی ئازادیان وەدەست هێناو ماسادۆنیاش بوو بە کۆمارێکی پاڵ یەکێتی کۆمارەکانی یوگسلاف.

ئەو شەش سەدەیەی کە بەسەر ماسادۆنیادا تێپەڕی برینێکی قووڵ و پڕ کارەسات و ڕووداوی جگەربڕی بەخۆیەوە دی.. زۆریان قوربانی دا.. گەلێک یاخی بوون بە چۆڵ و چیایان کەوتن.. زۆریشیان وەیان لێهات چەک هەڵگرن و ڕێگریی بکەن بەتایبەتیش ڕێیان لە بازرگانە تورکەکان دەگرت.. ڕووتیان دەکردنەوە.

ئەو ئازایەتی و قوربانی و خۆبەختکردنە بێ وێنەیەی ڕۆڵەی وڵاتەکەیان لەبیرنەچۆتەوە کە چ قارەمانییەتییەکیان لەپێناوی سەربەخۆییدا دەنواند، پاڵەوانیەتییەک کە لەگەڵ داگیرکەرە نازییەکاندا هەر بەردەوام بوو.

زۆربەی ئەم گۆرانیانە باسی خۆشەویستی و ژن هێنان و نەریت و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییە کۆنەکانیان دەکا..

تەماشا دەکەی تەنانەت گۆرانی شایی و داوەتانیشیان خاڵی نییە لە تراژیدیا.. لێدابڕانی دوو عاشقی سووتاو، کە لەوانەیە درێژە بکێشێ و بەکارەساتێکی خەمناک بگا.. چاوەڕوانی سێ ساڵان، بگرە گەلێک جار گەیشتۆتە نۆساڵ!! کە لەدواییشدا عاشقی سووتاو وبێ دەست مایە ناچار دەبێت خۆشەویستەکەی هەڵبگرێ و ئەویش ڕەدووبکەوێ..

بەم جۆرە فۆلکلۆری ماسادۆنی، تراژیدیایەکە بۆ خۆی، ئەمەیش هەروا نەهاتووە، بەڵکو بە درێژایی تاقیکردنەوەکانی مێژووی ئەو وڵاتە سەریان هەڵداوە.

## (1)

ئیڤۆ دەزیندانێ دایە
هەڵۆیەکی لەسەر شانی هەڵدەنیشێ..
چاوی ئیڤۆ هەڵۆ ئاو دەدەن..
لە سیمایشی تێر دەبێ..
– ئەی باڵدار
ئەوا گەورەو بەهێز بوویت
منیش دەتنێرمەوە ماڵێ
–چۆن دەتوانم، ماڵەکەتان بناسم
– حەوشەی ماڵمان



کانیەکی سپیی تێدایە،
دارێکی وشکی لەسەرە
سێ مەلی ڕەش، لەسەر ئەو درەختە وشکەن
مەلی یەکەم
کە لە سپێدەوە دەگری تا ئێوارە
خوشکەکەمە..
مەلی دووەم
کە لە نیوەڕۆوە دەگری تا نیوەشەو،
ژنەکەمە،
ئەوەی هەرگیز لەناڵەو فیغان ناکەوێ
ئەوە دایکمە

(2)

خۆر دادەکشێ..
کچێک
لە بەینی دوو دارستانی سەوزو
دوو دەریاچەی سارد
گوڵ دەچنێ..
لەخوا بەدەر
کەسی لەگەڵدا نییە
کەسێ نییە ئاگای لێ بێ



کە لەسەر خۆڵێدا پاڵ کەوت
بەردێکی لەژێر سەرابوو
بەرد مارێکی لەسەر بوو
«خوایە!
ئەو کیژە بمرێنە!
تا پرچی بکەم بە هێلانەو
لە گۆشتی دەم و چاوی بخۆم و
چاوەکانی بخۆمەوە..»
خوا نزای ماری قبوڵ کرد
کچەکە مرد
مار، پرچی کرد بە هێلانەو
لە گۆشتی دەم و چاوی خواردو
چاوەکانی خواردەوە..

(3)

مانۆلا، لەسەر (فاردار)
خەریک بوو پردێ دروست کا
ڕۆژان ئیشی لێ نەدەکرد
حەزی دەکرد شەوانە دەستی بداتێ..
چی بکا باشە؟
گەورەی کرێکارەکانی نارد
مانۆلیکای ژنی بانگ کا
ـ ئەی مانۆلیکا!



سەرۆک منی ناردووە
لە قەراخی ڕووبارەوە.. تۆی دەوێ..
زوو، زوو، تا پێت دەکرێ خێراکە!
ـ بە مانۆلا بڵێ،
کوڕەکەم دەنوێنم و دێم..»
کوڕەکەی دەنێو لانکێ نا
دەستی کرد بە گۆرانی بۆی..
ـ «ڕۆڵە باوکت منی دەوێ
دەیەوێ بەزووترین کات
لەسەر(فاردار)ئامادە بم..
ئەو گەر بۆ خۆشەویستی بێ
کراسێکی سپی دەپۆشم
ئەگەر بیەوێ بمکوژێ
کراسێکی ڕەش لەبەر دەکەم
ئەگەر بۆ ژوانێ بێ
ڕۆڵە بنووە خەوی خێرت بێ..
ئەگەر بۆ مردنیش بێ
ڕۆڵە خێرا لەخەو هەستە..»

بەرەو (فاردار) شۆڕ بووەوە..
ـ «مانۆلا! بۆ چیت بووم؟
گەر بۆ ژوانێ بێ سپی
ئەگەر بشتەوێ بمکوژی، ڕەش دەپۆشم..
مانۆلا دەستی گرت..
لەسەر دیوار:
ـ «ئەمن هەرگیز سووم لەخۆ نییە
مانۆلا، ڕەحمت بە کوڕەکەمان بێتەوە
کە دەگری و بەدوامەوە وێڵ دەبێ..»
لەوکاتەدا منالّەکە لەخەو ڕاپەڕی و..
خێرا بەرەو فاردار هات
بانگی دەکردو دەگریا
باوکی دەستی گرت، بەسنگییەوە گرساندنی
پێکەوە.. هەردووکیانی بەدیواری پردەکەوە نووساند..
لەوکاتەدا پرد بڵندبوو و
بیناش نەڕما..



## (4)

سەگەکان دەوەڕن..
کەواتە شەڕانییەکان خەریکن دێن..
خۆت لەنێو ئەم خاکە ڕەش داگەڕاوەدا
لەنێو سنگی زێڕینەوە..بشارەوە..
شەڕانی هاتن..
لێیان پرسین:
ـ کوا براکەت؟
ـ تۆ پیاو خراپی
نازانم براکەم لە کوێیە..
ـ گەر پێمان نەڵێی،
چاوەکانت دەرژێنین..
پێی نەوتن..

چاویان ڕژاند..
ـ پێمان نالێی کوا براکەت؟
ئەگەر نەلێی دەستت دەبڕین..
دەستیان بڕی..
ـ جێی براکەتمان پێ نالێی؟
ئەگەر نەلێی قاچت دەبڕین!
قاچیان بڕی و ڕۆیشتن..
بەزەوی ڕەش داگەڕاودا ڕەت بوون..
لەوێ، لە سنگی زێڕینییەوە
(بیتسانۆ)یان دۆزیەوە..
گرتیان..
پەلیان بەزنجیرێکی زیوین بەست و
بەرەو دارستانێکی دووریان برد..
(ئالینا ) قیژاندی
ئەی بێتسانۆ!
نە چاوم هەیە بتبینم
نەدەست باوەشت پێدا بکەم
نە پێم هەنە لەگەڵت بێم..



(5)

ڕۆژگاری ڕەش
(ستوجان)ی ماندوو کردبوو
نە خۆراک.. نە پارە
نۆ منداڵیش..
ستوجان خوشکێکی دەوڵەمەندی هەبوو
مێگەلێ مەڕو حەوت خەرمانی هەبوو..
ـ خوشکم!
نەختێ گەنمەشامیم دەویست
بۆ خۆراکی زارۆکان.. برازای خۆتن
ـ ستوجان، برام
بەو ڕێیەدا شۆڕبەرەوەو
چاوەڕوانی کاروان بکە
(300) ئێستری تەواون..

لەدوای کێشان و تاوتووکردنی گەنم
پاشماوەکەیت دەدەمێ
..............
ستوجان، برام
تەنیا دەنگێکیش زیاد نەبوو!!
ستوجان دەستی دایە تەلیسەکی
چووە شینکاو پری کرد لە لمی ورد..
هەڵی گرت بەرەوماڵەوە..
کە مناڵەکانی بینیان..
خێرا بەرەو پیرییەوە هاتن..
پێ خواس..برسی..
لمی وردو زێرینی بۆ هەڵڕشتن
خواردیان..
مردن..
گۆڕێکی بۆ هەڵکەندن، هەموویانی ناشت..
خۆیشی لەماڵێ هاتەدەر ببێتە ڕێگرا!!



(6)

هەموو شەوێ،
بە کراسێکی خوێناوییەوە دێتە لام
کەللەسەری براوی تیا پێچراوە..!
دایە ئەمڕۆ بەیانی دەستێکی بۆ هێنام
ئەڵقەیەکی زێڕی پێوەبوو..
من دەزانم ئەو دەستە هی کێ بوو،
ئای دایە!
بۆچی منت دایە ئەو پیاوە
ئەو دەستە براوە
دەستی کوستاندینی برام بوو..

(7)

بۆگدانا

لەسەر لووتکەی ئەو گردەدا خەو بردییەوە..

پەلکەگیا..رایەخی بوو..

سەرینی .. گوڵی چیابوو

قەدی سەوز .. لێفەی بوو

شوانێکی لاو.. بەلایدا رابوورد

نەدەیویست هەڵیبستێنێ..

نە دڵی دەهات جێی بهێڵێ..

بۆیە بەهەموو هێزیەوە

دەستی کرد بە شمشاڵ لێدان..





(8)

گەر گوڵت ویست،

شەونم لەسەر پەڕەی دابێ..

بەیانیان وەرە!

گەر ئاوێکی شیرینت ویست

لەنیوەڕۆیانا وەرە..

بەڵام کاتی خۆشەویستی.. ئێوارانە.



(9)

کوڕو کچێک یەکتریان خۆش دەویست و

ماچیان نەدەزانی..

کچە، کوڕەی بە چاوی ڕەشی ماچ دەکرد

کوڕەیش، دەنکە ترێی لەدەمی کچەکە دەنا..

گوێی لە خشپەی پێی دایکی بوو..

بۆ بازاڕ دەچوو، تاڵەگیا بکڕێ

ژەهراویان بکا..

کوڕەکە لەنیوەڕۆدا مرد..

کچەکەیش لەشەوا

لە یەکتری بەستن و

بە پەیتونێکی چوار ئەسپیی هەڵی گرتن

کچە لە نێوان دوو ڕێبیانداو
کوڕەش لەنێو سێبیاندا نێژرا..
کچەکە بوو بە بنەمێوێ
کوڕەکەیش بوو بە گوڵێ..
کچەکە هێشووی دا
کوڕەکەیش چڵی گوڵ..
بەیەک گەیشتن و لێک ئالان..
دایک ئەو  هەواڵەی زانی
چەقۆیەکی هێنا..
هێشووە چڵەکانی بڕی..
دوو ئاگری کردەوە هەر یەکی دەیەکی هاوێت
خۆڵەمێشەکەیشی کۆکردەوەو بە باخچەکەیدا بلاوی کردەوە
باخچە ڕێحانی لێ شین بوو..
ڕێحان پیاوان لە بن شەپقەکانیان دەنێن
کچانیش لەبەر بەرۆکێ..
منداڵانیش لەدەستی دەگرن..



(10)

سێ ساڵ بوو ستوجان
داوای بۆجانای دەکرد
داوای دەکردو
دایکی داواکەی ڕەت دەکردەوە..
بۆجانا ، خۆشی دەویست..
هەستا ..چووە ژوورەکەی..
سنووقە تازە بۆیە کراوەکەی کردەوە..
کراسە سپییەکەی دەرهێنا..
لەبەری کردو خۆی پێ خەملاند..
پێخەفی لە حەوشەی ماڵدا راخست و

لەسەری نووست..
خۆی مراند..
کە دایکی چاوی پێکەوت
هەموو پرچی خۆی ڕنییەوە..
دەستی کرد بە ناڵەو گریان..
براکانی وتیان:
ئەم کچە فریومان دەدا
دەچینە دارستان مارێک دێنین..
پێیەوە دەنێین..
چوونە دارستان..
مارێکیان هێناو پێیان وەنا..
نەبزووت



ـ پەنگران دێنین
هەر نەبزووت
وتیان:
با ستوجان بانگ بکەین
گەر مردنەکەی ساختە بێت
بگاتە ئێرە.. دێتەوە سەرخۆی..
هەڵدەستێتەوە
ستوجانیان بانگ کرد..هات و
دەستی دەمەمکان گێڕا..
هەستایەوە..
ـ ئەی چ شیرینە خەوێک بوو..
ـ مارمان پێوەنای.. نەبزووتی..!

بۆچی پێیەوە نەدای؟
ـ دایە کە مارتان پێوەنام
وەکو شەونم وابوو بۆمن..
کە پەنگرتان پێوەنام
خۆر هێمنی دەکردمەوە..
ـ بۆجانا
ئەی کە ستوجان دەستی بۆ مەمکان بردی..
بۆچی لەخەو رانەپەڕی.. نەترسای؟
ـ ئای – توخوا
ستوجان دەستی بۆ مەمکان بردم؟
کەوا بێ دەبێ مێردی پێ بکەم!



## (11)

ـ ستوجانیکا!
لێوەکانت بۆچی وەک لۆکەی زەرد هەڵگەڕاو وان..
ـ لە ئەژمەتان..
لە داخی سەفەری تۆ بۆ(ماربۆڤۆ)
ـ ستوجانیکا
خۆشەویستم
بەمەرگی ئەسپەکەم
دەستم بۆ هیچ ئافرەتێکی تر نەبردووە..
ـ ئەسپ خۆراکی کسۆکانە..
بە چاوانم سوێندم بۆ بخۆ..
ـ کوڕم بمرێ..
دەستم بۆ ئافرەتێکی تر نەبردووە
ـ کوڕی هی هەردووکمانە
بە چاوانم سوێندم بۆ بخۆ.

### لە ئەدەبی دێرینەوە

## گفتوگۆی کۆیلەو خاوەنەکەی

**«ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە نموونەیەکە لەو ئەدەبەی وێنەی داتەپینی شارستانی و کۆمەڵایەتی سەردەمەکە، سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ.ز دەکێشێ..» وەرگێڕ**

**خاوەن کۆیلە:** گوێ بگرە ئەی کۆیلە!
**کۆیلە:** بەڵێ گەورەم.. گوێم لێتە..
**خاوەن کۆیلە:** پەیتوونەکەم ئامادەکەو بیهێنە..
دەمەوێ بۆ کۆشک بچم



**کۆیلە:** بڕۆ گەورەم! بڕۆ!
ئارەزووەکانت هەمووی دێنە دی و بەختت یارو
پاشایش چاوی لێتەوە دەبێ..
**خاوەن کۆیلە:** نا ئەی کۆیلە نا..
ناچمە کۆشک..
**کۆیلە:** مەچوو گەورەم!
پاشا بە ئیشت دەنێرێ..
لەوێ لەخاکێکی غەریبەدا کە نایناسی بەدیلت
دەگرن..
بەشەو و ڕۆژ ماندوو وهیلاک..
**خاوەن کۆیلە:**گوێ بگرە ئەی کۆیلە!
**کۆیلە:** ئەوەتا گەورەم گوێم لێتە
**خاوەن کۆیلە:** هەر ئێستا ئاوم بۆ بێنە دەست بشۆم
دەمەوێ نان بخۆم.
**کۆیلە:** بخۆ گەورەم بخۆ!
خواردنی ڕێکوپێک دڵ دەکاتەوە
خوداوەند(شەمەش)یش لەو خوانە ئامادە دەبێ،
کە بەشادی و دەستی پاکەوە دەخورێ

**خاوەن کۆیلە:** نەخێر ئەی کۆیلە نان ناخۆم

**کۆیلە:** مەخۆ گەورەم مەخۆ..

بنیــادەم دوای خــواردن هەر برسی دەبێ و دوای خــواردنەوەش تینوو..

**خاوەن کۆیلە:** بەر ئەمرم بە ئەی کۆیلە! بەر ئەمرم بە!

**کۆیلە:** بەڵێ گەورەم ئەوەتام.. بەر فەرمانتم

**خاوەن کۆیلە:** بڕیارم داوە شۆڕشێک بەرپا بکەم

**کۆیلە:** بیکە گەورەم! بەرپای کە!

چی بەسەر گەوهەرتان دادێ..

کێ دەتداتێ وتێرت دەکا.. ؟

بیکە گەورەم! شۆڕشێک بەرپا بکە!

**خاوەن کۆیلە:** نا کۆیلە نا، شۆڕش ناکەم!

**کۆیلە:** مەیکە گەورەم مەیکە!

ئەوەی شۆڕش بەرپا بکا ئازار دەکێشێ و

لەشی دەشێوێنرێ و زیندان دەکرێ..

**خاوەن کۆیلە:** بەر ئەمرم بە! ئەی کۆیلە بەر ئەمرم بە!

**کۆیلە:** ئەوەتا گەورەم بەر فەرمانتم..

**خاوەن کۆیلە:** دەمەوێ حەز لە ئافرەتێک بکەم..



**کۆیلە:** بیکە گەورەم بیکە!

ئەوەی ئافرەتی خۆش بوێ

ئێش و ماندوویەتی لەبیر نامێنێ..

**خاوەن کۆیلە:** نا کۆیلە نا، دڵداریی ناکەم..

**کۆیلە:** مەیکە گەورەم، دڵداریی مەکە!

ئافرەت بیرێکە، ئافرەت خەنجەرێکی ئاسنینە

ملی پیاو دەپەڕێنێ..

**خاوەن کۆیلە:** بەر ئەمرم بە ئەی کۆیلە! بەر ئەمرم بە!

**کۆیلە:** بەڵێ گەورەم بەڵێ! ئەوەتا گوێم لێتە..

**خاوەن کۆیلە:** ئاوم بۆ بێنە دەستم بشۆم..

دەمەوێ قوربانییەک بۆ خوداوەند بکەم!

**کۆیلە:** بیکە گەورەم بیکە!

ئەوەی قوربانیی بۆ خوداوەند بکا.

قەرز دەخاتە سەرقەرزو بەختیار دەبێ..

**خاوەن کۆیلە:** نا کۆیلە نا قوربانیی ناکەم..

**کۆیلە:** مەیکە گەورەم! قوربانیی مەکە!

دەتوانی خوداوەند رابێنی

کە پێویستی

بەنوێژو قوربانیی دەبێ، دوات بکەوێ..

**خاوەن کۆیلە:** بەر ئەمرم بە ئەی کۆیلە!

**کۆیلە:** بەڵێ گەورەم بەڵێ.

**خاوەن کۆیلە:** دەمەوێ چاکە بکەم،

زەوییەکەم بکەمە سەدەقەو

خۆراک بە وڵاتەکەم بدەم

**کۆیلە:** بیکە گەورەم بیکە!

ئەوەی خۆراک بە وڵاتەکەی دەدات

جۆیەکە هەمووی بۆ خۆی دەبێ و قازانجی

فرەی پێدەگا!

**خاوەن کۆیلە:** نا ئەی کۆیلە! خۆراک نادەمە وڵاتەکەم..

**کۆیلە:** مەیدە گەورەم مەیدە!

بەخشش وەک دڵداریی وایە..

وەک لەدایکبوونی مناڵە..

ئەوا دانەوێڵەت دەخۆن و لەعنەتیشت

بۆ دەنێرن!

**خاوەن کۆیلە:** بەر ئەمرم بە ئەی کۆیلە! بەر ئەمرم بە!

**کۆیلە:** ئەوەتا گەورەم بەر فەرمانتم..



**خاوەن کۆیلە:** دەمەوێ یارمەتی وڵاتەکەم بدەم

**کۆیلە:** بیدە گەورەم!

ئەوەی یارمەتی وڵاتەکەم بدا

چاکەکانی دەگاتە خوداوەند مەردۆخ

**خاوەن کۆیلە:** نا ئەی کۆیلە!

هیچی واناکەم یارمەتی وڵاتەکەمی

تێدا بێت.

**کۆیلە:** مەیکە گەورەم مەیکە!

بەسەر هەوارە دێرینەکاندا تێپەڕە!

سەیری کەللەسەری ئێستا و ڕابردوو بکە!

کامەیان شەڕانیی و کامەیان چاکەخواز؟

**خاوەن کۆیلە:** بەر ئەمرم بە ئەی کۆیلە! بەر ئەمرم بە!

**کۆیلە:** بەڵێ گەورەم بەڵێ...

**خاوەن کۆیلە:** چاکە ئێستا لەدنیادا چ باشە؟

ملی تۆ و ملی خۆم پەل دەدەم!

یا هەردووکمان خۆمان بە ئاوێ دادەین

ئا ئەمەیە شتی باش!!

لێرەدا (خاوەن کۆیلە) ڕای خۆی گۆڕی و





به کۆیلەی وت:
نە ء کۆیلە تەنیا تۆ دەکوژم!
مەرگی تۆ بە پێش خۆم دەخەم
**کۆیلە:** وەڵام دەداتەوە: داخۆ گەورەم
لەدوای مندا تۆ دەتوانی
تەنانەت بۆ سێ ڕۆژیش بژی؟؟

# بیۆگرافیاو سەرچاوە

## *بیۆگرافیا*

*** داریۆش:** گۆرانیبێژێکی هونەرمەند و ئازادیخوازی ئێرانە، گەلێک جاران لەسەر گۆرانییەکانی خراوەتە زیندان.. زۆربەی ئەو شیعرانەی داریوش دەیانکا بە گۆرانی یا هی کەڵە شاعیرەکانی ئێرانن، یاخود هی هاوڕێکانی خۆیەتی، دووریش نییە چەندانێک هی خۆی بن.. ئەم هونەرمەندە، بە چەشنێک لە گۆرانییەکانیدا دەتوێتەوە، من خۆم تا ئێستا هونەرمەندی بەم جۆرە عاشقم نەدیوە. ئەم چوار گۆرانییەی لە کاسێتەوە وەرگیراون و کراون بە کوردی.

*** ئاینده:** ناوی تەواوی(ئیسماعیل شاهروودی)یە، یەکێکە لە شاعیرە نوێخوازەکانی فارس. ئەوەندەی من ئاگام لێ بێ تەنها دیوانێکی چاپکراوی هەیە.

*** فرووغی فەڕووخزاد:** فرووغ نەک تەنیا لە ئەدەبیاتی فارسیدا، بەڵکو لە هیی



ناوچەکە هەمووی (ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) وێنەی کەمە.. تا بڵێی هەست ناسک بوو، تا بڵێی شاعیر بوو، تاکو بشڵێی عاشق بوو.. جورئەت و چاونەترسیشی لەم لاوە بوەستێ.. لە تاران لەدایک بووە، بەداخەوە کە لە رووداوێکی جگەربڕدا، لە رێگای کەرەج ئۆتۆمبیلەکەی وەرگەڕاو..؟

*** ئا. ئاسلان:** ناوی تەواوی(ئاشووت ئاسلانیان)ە، شاعیرێکی ئەرمەنییە، ساڵی ١٩٠٧ هاتۆتە دنیاوە، لە گەلێک رۆژنامەو گۆڤاردا شیعری بڵاوکردۆتەوە، بە تایبەتی لە گۆڤاری (واردزنونەد).. ئەم شاعیرە بە هۆی هێزی خەیاڵ و هەستی ناسکییەوە بە یەکێک لە کەڵە شاعیرەکانی ئەرمەن لە قەڵەم دەدرێ.

*** زۆرایر میرزایان:** ساڵی ١٩١٦ لە دایک بووە، یەکەمین بەرهەمی لە رۆژنامەی(واردز نونەد)دا بڵاوکردۆتەوە، لەگەڵ زۆربەی چاپەمەنییەکانی(ئەرمەنی)دا ئاشنایەتی هەبوو، میرزایان، جگە لەوەی کە شاعیر بووە، چیرۆکنووس و(وەرگێڕ)ێکی چاکیش بووەو گەلێک بەرهەمی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئەرمەنی لەوانە(چوارینەکانی بابەتایەری هەمەدانی، مەشهود بەعوریان) و چەندانی دیکەش.

*** ئارشاویر مەگردیچ:** ناوی(ئارشاویر مەگریدیچیان)ە ساڵی ١٩١٣ چاوی بە دنیا هەڵێناوە،(مەگریدیچیان)یش بەشداریی زۆربەی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی کردووە کە بە زمانی ئەرمەنی دەردەچوون یەکەمین بەرهەمی لە ساڵی ١٩٥٧ دا چاپ کردووە.

*** گالۆست خانس:** (گالۆست خانیان) ناوی تەواویەتی، ساڵی ١٩١٠ لەدایک بووە، یەکەمین بەرهەمی لە ساڵی ١٩٢٨ دا بڵاوکردۆتەوە، بەشداریشی لە زۆربەی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەدا کردووە کە بە زمانی ئەرمەنی دەردەچوون.
لە ساڵی ١٩٤٦ و ١٩٤٨ دا لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی دەبێتە مامۆستا.
ساڵی ١٩٥٧ هەموو شیعرەکانی لە دیوانەکەیدا(تەواوی دڵ) کۆکردۆتەوەو چاپی کردوون.

*** خەسرەوی گوڵسورخی:**
(گوڵسورخی) یاخود شاعیری شۆڕشگێڕ، ئەو شاعیرەی کە بەدەستی چەپەڵی رژێمی شاوە شەهید بوو.. بەڵام ئەوەندە بەس بوو کە عاشق بوو، عاشقی هەتاو، عاشقی راستی و عاشقی خاک و وڵات..

ئەوەتا لەو کاتەیدا کە دەیانەوێ بیکوژن و سەربازەکە(جەللادەکە) دەیەوێت چاوی ببەستێت، ئەم ناهێڵێ چاوی ببەستن، بۆیە پێی دەڵێت:(برا چاوی من مەبەستەوە من دەمەوێ لە تیشکی هەتاو رامێنم..).
گوڵسورخی شاعیرو شەهید و عاشق، گوڵسورخی مرۆڤ و باوک، تەنها کوڕێکی لەدوای خۆی بەجێ هێشت ئەویش ناوی(داموون)ە.
* **فەرەیدوونی موشیری:** یەکێکە لە هەڵگرانی ئالآی شیعری نوێی فارسی.. تاکو ئێستا چەندەها کۆمەڵەی شیعری بڵاوکردۆتەوە.
* **ئیرەجی جەننەت عەتائی:** شاعیر زیاتر وەک شاعیرێکی گۆرانی ناسراوە.. چەند کۆمەڵە شیعرێکی بڵاوکردۆتەوە، کە زۆربەیان کراونەتە گۆرانی.
* **نادری نادر پوور:** لە١٦ی مانگی خوردادی ساڵی ١٣٠٨ ی ئێرانی لە تاران هاتۆتە دنیاوە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندیشی هەر لەوێ تەواو کردووە.
ماوەی سێ ساڵان لە پاریس ماوەتەو و ساڵ و نیوێکیش لە ئیتاڵیا.. هەردوو زمان دەزانێ، فەرەنسی و ئیتاڵیایی.
گەلێک کۆمەڵە شیعری بڵاوکردۆتەوە بێجگە لە چەندین وتاری رەخنەیی و چەندین شیعر و وتاری لە فەرەنسی و ئیتاڵی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، ژنی هێناوەو تەنها کچێکی هەیە ناوی(پوپک)ە.
* **م. ئومێد:** شاعیر ناوی تەواوی(مهدی اخوان پالپ)ە، ساڵی ١٩٢٧ لە شاری (مەشهد) لە دایک بووە، مامۆستای قوتابخانەیە، تا ئێستا (٧) کۆمەڵە شیعری بڵاوکردۆتەوەو هەروەها باسێکی رەخنەییشی لە کتێبێکدا، لەسەر شاعیری بەناوبانگ(نیمایوشیج) نووسیوەو بڵاوی کردۆتەوە.
* **عاتیفەیی گورگین:** خاتوو(عاتیفە) شاعیرو رۆژنامەنووسێکی هەڵکەوتووە، هاوسەری شاعیری شۆڕشگێڕ- گوڵسورخی یە- لە پاڵ شیعر نووسین و بڵاوکردنەوەیشدا چەندین گفتوگۆی ئەدەبی بە پێزیشی لەگەڵ کەڵە شاعیرەکانی ئێران سازداوە.

ئەم شیعرەی- ئەی ئومێدی پیرۆزی من- بۆ- گوڵسورخی- هاوسەری گوتووە.
* **سوعاد تاشەر:** شاعیرێکی هاوچەرخی تورکییە.
* **ئومێت یاشار:** شاعیرێکی هاوچەرخی تورکییە.
* **کۆستەنێن کەفافی:** شاعیرێکی یۆنانییە کە لەشاری ئەسکەندەریە لەدایک



بووە.
* **فازڵ عەززاوی:** شاعیرێکی عێراقییە لەوەچەی شەستەکان.
* **ئەحمەدی شاملو:** شاعیرێکی نوێخوازی ئیرانی بەناوبانگە.
* **هانریخ هاینە:** شاعیرێکی ئەڵمانی بەناوبانگە.
* **ستیڤان ئۆکتاڤیان:** شاعیرێکی رۆمانییە، ساڵی 1870 لەدایک بووەو ساڵی 1913 کۆچی دوایی کردووە.
* **مەعین بەسیسۆ:** شاعیرێکی عەرەبی میسریە.
* **رامبۆ:** شاعیری فەڕەنسی بەناوبانگ.
* **ژاک بریڤێر:** شاعیری فەڕەنسی بەناوبانگ.
* **نازم حیکمەت:** شاعیری بەناوبانگ و پێشکەوتووخوازی تورک.
* **یاشار میراج:** شاعیرێکی نوێخوازی تورکە.

## سەرچاوەی شیعرەکان:

* چوار گۆرانییەکانی داریوش: لە شریتی کاسێتەوە خۆم دەقەکانیانم نووسیوەتەوە، ئینجا کردوومن بە کوردی.

عیشق: بڕوانە لاپەڕە(43ی کتێبی) (راهیان شعر امروز) کۆکردنەوەی داریوشی شاهین.

* ئەی ئەستێرەکان

دەردو ماڵئاوایی

بڕوانە لاپەڕە(21و36)ی (برگزیده اشعار فروغ فرخزاد)

چاپی سێیەم:

* بۆ ئەم شیعرانە: (کەوانەی مانگ، دەنگی خوێن، مۆتەکە، پاسەوان، سەد ساڵی تر)بڕوانە، ژمارە(11)ی ئوردیبەهشتی ساڵی 1349 ی ئێرانی، گۆڤاری(سخن).

نووستووی بەرباران: بۆ دەقی ئەم شیعرەی گوڵسورخی، بڕوانە لاپەڕە(304)ی (راهیان شعر امروز) کۆکردنەوەی داریوش شاهین.

* فرمێسکێ لە گوزەرگای مێژوودا: بڕوانە لاپەڕە(324)لە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

* خەنجەر: بڕوانە لاپەڕە(124)ی هەمان سەرچاوەی پێشوو.

* ستەم: بڕوانە لاپەڕە( 43)ی کتێبی: (برگزیده شعرهای نادر نادر پوور)

شایانی باسە کە شاعیر، ئیلهامی ئەم شیعرەی لە شاعیری فەرەنسی بەناوبانگ (رامبۆ) وەرگرتووە خۆیشی ئیشارەتی بۆ کردووە.

* پەنجەرەیەکی خامۆش: بڕوانە ژمارە(گۆڤاری)تماشا.



* ئێوارە: بۆ دەقی ئەم شیعرە بڕوانە لاپەڕە(103)ی دیوانەکەی نادر(سرمهء خورشید) چاپی چوارەم.

* نیاز: بڕوانە لاپەڕە(146)ی (برگزیدهء شعرهای نادر نادر پور).

* خەم: بڕوانە کتێبی(برگزیدهء شعرهای م. امید).

* ساتی یەکتر بینین: بۆ دەقی ئەم شیعرە، بڕوانە لاپەڕە(68)ی (راهیان شعر امروز) کۆکردنەوەی داریوشی شاهین.

* ئەی ئومێدی پیرۆزی من: بڕوانە لاپەڕە(309)ی هەمان سەرچاوەی پێشوو.

* بیرکردنەوە- سوعاد تاشەر: بڕوانە (قصائد مختاره من الشعر الترکی المعاصر- وەرگێڕانی عبداللطیف بندر اوغلو-بەغدا 1978 لاپەرە (129).

* ئومێت یاشار: هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (148).

* شیعرەکەی گریگۆری کۆرسۆ: عبدالوهاب بەیاتی (صوت السنوات الضوئیه) دەزگای الشروق قاهیرە 1977 لاپەرە (71).

* نانی رۆژانە- ماکسیم تانگ: بڕوانە (مختارات من الشعر السوڤیتی)، بلاوکردنەوەی دەزگای رادۆغا- مۆسکو 1985.

* گۆرانییەکی کالاو بۆ کریستینا- بڕوانە رۆژنامەی (الجمهوریه)ی بەغدایی رۆژی 1975.12.19.

* شیعری (لەگەڵ کۆچ پێکراوێکدا)، بڕوانە (مختارات من الشعر السوڤیتی)، بلاوکردنەوەی دەزگای رادۆغا- مۆسکو.

* یاشار میراج: بڕوانە (الأدب الترکی الحدیث-ملامح ونماذج- د.محمد نورالدین- بلاوکراوەی الدار العالیه 1984.

* لەئەدەبی دێرینەوە- بڕوانە مامۆستا تەها باقر- سەرەتایێک بۆ ئەدەبی عێراقی دێرین، بەغدا-1976.

# هەوڵە چاپکراوەکان

***1) لەبواری لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنووسیدا***

* ڕۆژنامەگەریی کوردی و ڕۆژنامەنووسی کورد
نامیلەکە-چاپی 1984، بەناوی خوازراوی
(پاکزاد محمد کریم)، چاپکردن و بڵاوکردنەوەی یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان(لەشاخ)
چاپی دووەم بەناوی سەریح، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، 1991
* پرۆژەیەک بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بەکوردی
لێکۆڵینەوە-گۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ) بەغدا، پایزی 1986
* هەڵەی چاپ، ئەمڕۆ ئاسۆی دوا ڕۆژ
لێکۆڵینەوە-بەدووبەش، ڕۆژنامەی (هاوکاری) بەغدا1988
* وێنەو کاریکاتێرو تایپۆگرافیاو بەکارهێنانیان لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوە-بەسێ بەش، گۆڤاری (کاروان ژمارە 85و 86و 87)ی 1990.
* برایەتی: یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا-چاپی یەکەم گۆڤاری(یەکگرتن) کە لە هەندەران دەردەچێ، چاپی دوەم چاپخانەی خەبات 1991. چاپی سێیەم چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر-1997.
* ئاژانسی دەنگوباسی کوردستان(ئاداک-ADAK)
پرۆژەی دامەزراندن و بەڕێوەبردن
لێکۆڵینەوە-ڕۆژنامەی (برایەتی) بەسێزدە ئەڵقە، هەولێر-1993، چاپی دووەم بە کتێب چاپخانەی خەبات دهۆک 1997
* درەختی بنکۆڵکراو:
پەنجەنمایێکی ڕۆژنامەنووسیانە بۆ باری ڕووناکبیری و کلتووری کوردی چاپی یەکەم کوردستان-1995، چاپی دووەم سوید 1996.
* چەند وتارو نووسینی تر هەر لەم بوارەدا لە شوێنی جیا جیا بە کوردی و عەرەبی.

***2) شیعر***

* ئەو شەوانەی خەون نایێ:
چاپخانەی (النعمان)نەجەف-1977
* تاڤگەی مەند
چاپخانەی (شفیق) بەغدا-1987

* چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی:
چاپی یەکەم- ئیتاڵیا -1994
چاپی دووەم- کوردستان- 1995

### 3) لەبواری وەرگێڕاندا

* نووستوی بەر باران:
شیعر، چاپی یەکەم- چاپخانەی (علاء)بەغدا-1980
چاپی دووەم- کوردستان- 2005
* ڕێگاوبان
پێنج چیرۆکی درێژو شانۆنامەیەک لە نیکۆلای خایتۆڤەرە-چاپی یەکەم-
چاپخانەی (الحوادث) بەغدا-1983 بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی حەیدەری.
چاپی دووەم-کوردستان-2005-دەزگای موکریانی.
* سەرتاییەک بۆ تێگەیشتنی هونەری شێوەکاری
چاپی یەکەم- چاپخانەی(حسام) بەغدا 1986
چاپی دووەم- کوردستان- 2005-دەزگای موکریانی.
* چەند نامەیەک بۆ تارانتابابۆ:
شیعری نازم حیکمەت.
چاپی یەکەم-چاپخانەی (الزمان)بەغدا-1990.
چاپی دووەم- کتێبی ئەرزان- سوید-1996.
چاپی سێیەم- کوردستان-2005.
* دایکی کورد-دانییێل میتران
لە عەرەبییەوە 1996 - چاپخانەی خەبات-دهۆک.

### 4) کاری شێوەکاری (کۆلاژ)

***پاییزی چاوەکان***
کۆلاژ لە تاراوگەی شیعردا -چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری-هەولێر 1998.
*** چاوەکان.. هەمیشە چاوەکان...**
کڵاو ڕۆژنەیەک لە شەختەدا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری 1999
5) (شرفه) بە زمانی عەرەبی، چاپخانەی خەبات- دهۆک-1998.
6) بێجگە لە دەیان شیعری وەرگێڕدراو و نووسینی دیکەو گۆشەی جیا جیا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا لەکات و شوێنی جیاجیادا بەکوردی و عەرەبی.

# *Sleeper under the rain*
**A Collection of foreign poetery**

**Translated into Kurdish**
**by:**
***Nazhad Aziz Surme***